1

ڕۆژنامە ـ گۆڤار

# ئیبراهیم ئەحمەد

## یادگارو هیوا



نیگاری : هاوڕێ ئەنوەر فەخری

مانگانەیەکی ڕۆشنبیرییەو هەر ژمارەی تایبەتە بۆ داهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەری دەکات

**دەستەی راوێژکاران**

حسێن عارف

ڕەووف بێگەرد

ڕێبین ئەحمەد هەردی

**سەرپەرشتی گشتی**

شێرکۆ بێکەس

**بەڕێوەبەری رۆڤار**

دلشاد عەبدوڵڵا

**ئەندامانی کارگێڕ**

عەتا محەممەد

فەرەیدون پێنجوێنی

**سەرپەرشتی هونەری**

قادر میرخان

1

5/5/1999

### هونەرمەند : هاوڕێ ئەنوەر فەخری

ساڵی ١٩٥٨ لەسلێمانی لەدایک بووە، ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدای ساڵی ١٩٨١ تەواو کردووە، بەشداری لە چەند پێشانگایەکی تایبەتی و هاوبەشدا لەناوەو دەرەوەی وڵاتدا کردووە، ئەندامی (کۆمەڵی هەشت) بووە، چەند خەڵاتێکی وەرگرتووە، ئێستاش مامۆستایە لە کۆلێژی هونەری زانکۆی سلێمانی.

## رۆڤار چی‌یە و بۆچی‌یە؟

(رۆڤار) وشەیەکی تازە دۆزراوە نییە بیخەینە ناو فەرهەنگی زمانی کوردی‌یەوە، بەڵکو تەقلیدێکی تازەیە بۆ جوانتر نیشاندانی ئەستێرە درەوشاوەکانی ئاسمانی ئەدەبیمان. ئەم ووشەیە لێکدراوێکە لە دوو لەتە ناوێنە، موتوربەکردنی چڵی وشەیەکە لەسەر قەدی وشەیەکی دیکەوە، تا ئەو چڵە سەوزەی لێی شین بێ و سێبەرێکی ئەخشین دروست بکا بۆ پشوودانی کەڵە داهێنەرانمان لە ئێستاو رابردوودا.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە پرۆژە ئەدەبی و رووناکبیری‌یەکانی خۆی‌دا بڕیاری دەرکردنی ڕۆژنامە- گۆڤارێکی‌دا بۆ ئەوەی مانگانە لە چەند لاپەڕەیەکی شیاو وشایستەدا، هەرجارەی باسی داهێنەرێکی کوردبکات، یا داهێنەرێك کە بە ڕەچەڵەك یا بەزمانی نووسین کورد نەبێ بەڵام بەقەد دار بەرووبەك نزیك بێ لە کورد وەکو (گۆنتەرگراس، ئیسماعیل بێشکچی، سەلیم بەرەکات، یە[illegible] کەمال . هتد). بۆیە ئەم پڕۆژەیە هەردوو پیتی (ڕۆ) ی لە وشەی ڕۆژنامە هەڵپاچی و خستیە سەر هەردوو پیتی (ڤار) ی گۆڤار و پێکەوە وشەی (رۆڤار) یان دروست کرد.

(رۆڤار) هەرجارەی چەند لاپەڕەیەکی بڵاوکراوە و بڵاونەکراوە، ژیان و نووسینی، باری سەرنج و بۆچوونی، چاکترین دەقی داهێنەران، هاوشان لەگەل وێنە و هێلکاری و مۆتیڤی گونجاودا بڵاودەکاتەوە، بەجۆرە دەرهێنانێکی هونەریی تازە کە هەماهەنگی لە نێوان وشەو رەنگ و هێلکاری تەواو بەرجەستە بێ، ئەمەشیان کارێکی تازەیە و پێویستی بە خوێندنەوەیەکی تازە و دۆزینەوەی رەهەندە جیاجیاکانی ژیان و نووسینی داهێنەرەکانەوە هەیە.

دیارە (رۆڤار) لە جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەی‌دا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك بەربەست و کێشە دەبێتەوە، لەوانە چۆنیەتیی هەڵبژاردنی جوانترین دەق کە هەندێکیان زەمان ساغی کردۆتەوەو هەندێکی تریش دەکەوێتە ئەستۆی دەستەی کارگێڕو هەڵسوڕێنەرانی (رۆڤار)، و پەیوەندیی بە سەلیقەو تێگەیشتن و گۆشەنیگای بینینی تازەوە هەیە، بینینێك کە ئەودیوی دەقەکان جوانتر ببینێ و بەردەوامبوون و کاریگەریی دەقەکە لە کۆن و ئێستادا دەستنیشان بکا، دەقێك کە داهێنەران کۆك بن لەسەری و لەگەڵ ڕۆژگاردا کاڵ نەبووبێتەوە.

کێشەی دیکە بریتی‌یە لە پەرت بوون و کۆنەکرانەوەو دەست نەکەوتنی بەرهەمی بەشێکی داهێنەرانی کورد. بۆ نموونە بەرهەمەکانی چیرۆکنووسێکی گومناوی وەکو (لەتیف حامد، یا ژیان و تابلۆکانی دانیال قەساب، یاژیان و بەرهەمەکانی موحەڕەم محەممەد ئەمین هتد)، کە بێگومان ماندووبوون و گەڕان و سەر لەنوێ خوێندنەوەی هەموو بەرهەمەکانی دەوێ، ئەوە سەرباری دەست نەکەوتنی فۆتۆگرافی کەسی داهێنەر و وێنەی ئەو شوێنانەی کە تێیدا ژیاوە.

ماوەتەوە بڵێین لیستی ناوەکان چۆن هەڵدەبژێرین و بۆ لە ئیبراهیم ئەحمەدەوە دەستمان پێکرد؟

دەستەی بەڕێوەبەری دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە ژمارەکانی داهاتووی رۆڤاردا ناوی هەموو ئەو داهێنەرانە بڵاودەکاتەوە کە هەڵبژێردراون لە ماوەی ساڵی ١٩٩٩ دا ژمارەی سەربەخۆیان بۆ تەرخان بکرێ، ئەم ژمارەیە لە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد (بەتەمەنترین زیندوو) ەوە دەستمان پێکرد، کە زۆربەی بەرهەمەکانیمان لەبەردەستدا بوو. ئیبراهیم ئەحمەد (بلە) یەکێکە لە چیرۆکنووس و ڕۆژنامەوان و پەخشان نووس و شاعیر و وەرگێڕە، هەرە دیارەکانی کورد و (ژانی گەل) و (کوێرەوەری)و (گۆڤاری گەلاوێژ) سێ سەبەتەی زێڕینی پڕ لە گوڵی باخچەکانی داهێنانی ئەو داهێنەرەن و سێ ئەستێرەی هەرە درەوشاوەن لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردی‌دا.

(رۆڤار) دەچێتە ناو ژانی گەل و ڕێگەی ئوخاوی کوێرەوەریەکان دەبڕێ و گوێ بەدڕك و داڵ نادا و لە هەر کوێ‌یەك گوڵێکی سوور ببینێ، بۆی دەچێ.

(رۆڤار) مانگانەیەکی رۆشنبیری‌یەو هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێك

ناونیشان: سلێمانی فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپو پەخشی سەردەم - رۆڤار - ت: ٢٩٨٣٩

لەدەرەوەی کوردستان:

Tel: 0044 162 846008 Fax: 0044 162 84 77660



## چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووس

# ئیبراهیم ئەحمەد

# (بلە)

*ساڵی ١٩١٥ لە سلێمانی لە دایك بووە
*بەشێکی منداڵیی لە گەڕەکی دەرگەزێن بەسەر بردووە، ماوەیەکیش لەگەڕەکی صابونکەران ژیاوە.
*ساڵی ١٩٣٧ لە بەغدا کۆلێجی (حقوق)ی تەواوکردووە و لەساڵی ١٩٤٢-١٩٤٤ حاکم بووە.
ئەو ساڵەی حقوقی تەواوکرد نامیلکەیەکی بڵاوکردەوە بەناوی (الاکراد و العرب) کە باسی لە پەیوەندی نێوان هەردوو نەتەوەو ئاسۆی هاوکارییان دەکا.
*لەنێوان ١٩٣٩-١٩٤٩ بەهاوکاری خوالێخۆشبوو عەلاء الدین سجادی گۆڤاری "گەلاوێژ" ی لە بەغدا دەرکردووە.
ئەو گۆڤارە سەردەمێکی زێڕینی لە ژیانی ئەدەبی و ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا هێنا پێشەوە و زمانی کوردییشی لە درك و داڵ پاك کردەوە. ئەگەر بەراوردێك لە نێوان زمانی کوردی لەسەردەمی "گەلاوێژ" و زمانی کوردی سەردەمی شێخ مەحمود بکەین ئەو جیاوازییە لە ڕێنووس و بەکوردی پەتی نووسین و ڕەوانی داڕشتن دا بەڕوونی دەبینین.
"گەلاوێژ" جگە لەوەی بواری لەبەردەم داهێنەران ڕەخساند بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمیان و گەیاندنی دەنگیان، بەهەمان شێوە پردێکی باشیشی دروست کرد بۆ گەیاندن و ناساندنی ئەزموونی ئەدەبی میللەتانی تر ئەویش لەڕێی وەرگێڕانەوە، کە ئیبراهیم ئەحمەد پێشەنگی ئەو ئەزموونە بوو.
لەوێ جگە لەو بەرهەمانەی ناوی خۆی بەسەرەوە بوو، زۆرجار بەناوی خوازراوەوە (بلە، ب، ه ل، ن ا ) نووسینی جۆراوجۆری بڵاو دەکردەوە.
*ئیبراهیم ئەحمەد یەکێکە لە پەخشان نووسە هەرە دیارەکانی کوردو، ڕووداوی ناڵەباری خۆماڵی، خەباتی چەوساوەو هەژاران، ئەخۆشیی بیرۆکراتی، ترکەو ڕاپەڕینی جوتیاران، گەندەڵیی سیاسی، ژیانی پڕمەینەتیی ژنی کورد و کۆڕی خەبات، سیمای هەرە دیاری ناو چیرۆك و ڕۆمان و پەخشانەکانین.
لەشیعردا جۆرە شەفافیەتێکی ڕۆمانسی خەرمانەی لەدەوری ئەو واقیعە تاڵەدا بەستووە و ئەمەش بەڕوونی لە "یادگار و هیوا" و بەشێکی شیعرەکانی تریدا دیارە.
*ساڵی ١٩٤٩ ئیبراهیم ئەحمەد گیراو ڕەوانەی بەندیخانەی ئەبوغرێب کرا، چرای گەلاوێژ کوژایەوەو لەڕێی بەرەو زینداندا شیعری "دراو تیری کەوان" ی وتووە.
*جیهانی پڕ لە کێشمەکێشمی سیاسەت و دەربەدەری بەشێکی زۆری توانای ئەدەبیی ئیبراهیم ئەحمەدی پەرش و بڵاوکرد، بەتایبەتی کە ماوەیەك سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، بۆیە دوای ڕۆمانی "ژانی گەل" کە بەردی بناغەی ڕۆمانی کوردیی دانا- ئیتر ئەستێرەی داهێنانی کەمتر ڕوو لە درەوشانەوە بووە.
"ژانی گەل" ساڵی ١٩٥٦ نوسراوە، ١٧ ساڵ دواتر ئینجا بڵاوکرایەوە.
* ئیبراهیم ئەحمەد جگە لە چیرۆك و پەخشان و شیعرو وەرگێڕان، ڕۆژنامە نووسێکی بەتوانا بوو جگەلە گۆڤاری گەلاوێژ کەخۆی خاوەن ئیمتیازی بوو، ساڵی ١٩٥٨ ئیمتیازی ڕۆژنامەی "خەبات"یشی وەرگرت و ماوەیەکیش لە بەغدا ڕۆژنامەی "کوردستان" ی دەرکردووە.
*یەکەم بەرهەمی لە ڕۆژنامەی "ژیان" لە ساڵی ١٩٣٢ بڵاوکردۆتەوە و دواجاریش لە لەندەن "چریکەی کوردستان" ی چاپ و بڵاو دەکردەوە.
* دوابەرهەمی بڵاوکراوەی ڕۆمانی (درك و گوڵ)ە.
* ئێستا لە لەندەن دەژی.

# یادگارو هیوا

لەبەر چاوی بەد، لەترسی بەدکار
دڵ خۆم ئەکەمە گۆڕی یادگار
بەگریانی وشك بەناڵەی بێدەنگ
دێنمە لەرزین تەختی کردگار

بێ، هێزی ئەژنۆم، بینایی چاوم
ئارامی گیان، جەرگم، هەناوم
یاخو بەجارێ چارەسەرم کە
یا لەنامەی ژین، دەربێنە ناوم

ژیان بەلاتیو بێ دەسەلاتی
هیچ درۆی نەبێ سەد مەرگەساتی
مرۆڤ بەدیلی بژی خۆشە، یان
بمرێ بۆ بەرزی گەل‌و وڵاتی

شیرین بەهارە، بەهاری شادان
بێ بەهرەن لەژین گەل نامرادان

* * *

جەژنو بەهارو سەیرانو خۆشی
گشتی پیرۆزی گەردن ئازادان

شیرین ئەزانم کە تۆش زاماری
وەك من عەودالی خونچەی بەهاری
هیوای تۆ یەکەو هیوای من هەزار
من بێزار نەبم تۆ بۆ بێزاری؟
مەژی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان
چۆن قازانج نەکەی تا نەکەی زیان
لەزرەی زنجیر دڵت نەلەرزێ
پێوەند بۆ لەشە نەوەك بۆ گیان

بێ دابنیشین لەبن هەناران
کۆڕێ ببەستین چوون مەی کۆساران
با ساتێ ناوی لەیادا نەبێ
مەرگی جوانان ناڵەی هەژاران
بێ دابنیشین لەبن داری بەی
ئەختێ بنۆشین لەخۆشاوی مەی
ئنجا بیزانین کامیان جوانن
بەی رەنگی گەردن، مەی رەنگی گۆنەی

بێ بابۆت بکەم باسی جوانیم
رۆژانی بەرخیم شەوانی شوانیم
کۆرپەی ئازیز بووم شوانکارەی شادی
ژیام بەخۆشی هەتا توانیم

ژیام سەردەمێ بەکەیفو خۆشی
بەشادی کڕین بەخەم فرۆشی
تاکو پێم کرا ڕوومەتم مژی
تاکو توانیم شەرابم نۆشی

ئەوساکە چوومە ریزی دڵداران
پێی وتم سەردار، هۆزی هەزاران
بێ دابنیشین لەپای دیواران
زنجیر لەگەردن چوون گوناهکاران

بێ دابنیشین لەنێو ڕەزانا
خونچە بکێشین بەڕووی خەزانا

من بەماچ دزین تۆ بەدڵ دزین
هەزار پەڵ بدەین وەپشت دزانا
بێ دابنیشین لەنێو گوڵشەنا
لەژێر سێبەری دارو دەوەنا
لەترسی دوژمن بەسۆزەی بەیان
گفتوگۆ بکەین لەگەڵ وەتەنا
بێ دابنیشین لەبن چناران
لەچاوی مەستی دیدە خوماران
بێ دابنیشین دیدە پڕ ئەسرین
تۆ بگری بۆ خۆت منیش بۆ شیرین
"وا بەهاریش هات کەژو کۆ رەنگین
دڵەی عالەم شاد دڵ خۆمان غەمگین
بەهار هاتەوە وەسەیرانەوە
وە لێلێو لۆلۆ وەحەیرانەوە"
بەلەنجەو لاری نیگارانەوە
بەدەنگی خۆشی هۆزارانەوە
بەهار هاتەوە خۆشی لەیاران
خۆشی لەگوڵشەن خۆشی لەداران
خۆشی لەگۆڕی بادەگوساران
خۆشی لەبولبول خۆشی لەخاران
خۆشی لەعالەم دوور لەدڵی من
شەونم بۆ خاران دوور لەگوڵی من
زنجیر پیرۆزی دڵ مردوان بێ
بائازاد بژی (بیری میللی) من
شێوەی شیرینی کەژی خوێنینم
شیرێکە لەسەر زامی برینم
ئازاد کردنو بەرزی وڵاتم


یادگار و هیوا
لەبەر چاوی بەد لەترسی بەدکار — دڵ خۆم ئەکەمە گۆڕی یادگار
بەگریانی وشك بەناڵەی بێدەنگ — دێنمە لەرزین تەختی کردگار
شیرین بەهارە بەهاری شادان — بێبەهرەن لەژین گەل نامرادان
جەژن و بەهار و سەیران و خۆشی — گشتی پیرۆزی گەردن ئازادان
بێ هێزی ئەژنۆم بینایی چاوم — ئارامی گیان جەرگم هەناوم
یاخوا بەجارێ چارەی دەردم کە — یا لەنامەی ژین دەربێنە ناوم
ژیان بەلاتی و بێدەسەلاتی — هیچ درۆی نیە سەد مەرگەساتی
مرۆ بەدیلی بژی خۆشە یان — بمرێ بۆ بەرزی گەل و وڵاتی

هیوای گیانمەو ئامانجی ژینم
بێ دابنیشین دووریین لەشادی
بمرین بەمەردیو گەردن ئازادی
بمرین لەڕێگەی تۆڵە سەندنا
نەك لەسەر جێگە بە نامرادی
پرشنگی دینم وەبیناتەوە
کورەی دەروونم وەگۆناتەوە
"هەستە بێرە لام خۆر وەپاتەوە
دەرمانی دەردم هاوەڵاتەوە"

شیرین هەتاکەی دووری بچێژم
فرمێسکی خوێنین تاکەی بڕێژم
تاکەی لەگۆشەی دڵی زارما
خونچەی جوانیو گەنجی بنێژم
ئەوا تۆ ئەڕۆی بەخوام سپاردی
پێم نەکرا خۆم بێم دڵم بۆ ناردی
ڕێی ژیان سەختە بەترسو لەرزە
نابێ بترسی لەگەرمیو ساردی
دڵە شیرین ڕۆی بڕۆ لەشوێنی

کە شیرین ڕۆیی تۆ بۆ بمێنی
بەڵێن بێ ئیتر نەتناسم هەتا
مژدەی ئازادیی یارم بۆ دێنی
چاوە وەك لێزمەی بارانی بەهار
فرمێسکی خوێنت بۆ پیا دێتەخوار
گریان کردەوەی بێ دەسەڵاتە
بێ دەسەڵاتان ئەڕزێن لەژێربار

*

## دووا تیری کەوان



دووا تیری کەوانی خۆت بهاوێژە هەلە دوژمن
دووا سەرکەوتنی تۆیەو دووا نووچی گەلە دوژمن
شەوی ترساندت سامی نەماوە تاریکو روونە
بەئاسۆی ئەرخەوانیدا هەتاو لەودیوو کەلە دوژمن
چ گەوجی هەژ بەسەر کەی خۆر بە هێڵەك پێشی گیراوە؟
وەیاخو چەرخی مێژوو کەی بە بەردی ئێوە وەستاوە؟
هەموو پێشکەوتنێکی تۆ بەرەو چاڵی نەمان ئەتبا
هەموو سەرکەوتنێکیشت بەوێنەی بڵقی سەرئاوە
ئەوە هێتلەر خواوەندی شەڕی سەر رووی زەمین بوو خۆ
قەڵای سەرمایەداری پڕ تفاقی ئاسنین بوو خۆ
هەموو ئەڵمانیای نازی لەدەستا وەك نگین بوو خۆ
لەڕێی ئازادیخوازانا وەکوو شوورایی چین بووخۆ
کوا (فیرماخت) ی ئەڵمانی کە ئەتووت هەر زەوی خوێنە
کوا (لوفوافە) ئەو هێزە ئەپارێزە مەرگ چێنە
کوا تۆپی کوا تانکی؟ کوا ئوستولی بێ وێنە؟
بەجارێ گۆڕی گوم بوو گشتی وەك خۆی بێسەرو شوێنە
لەلای ئێمە هەڵئەنگوتن، یەکەم هەنگاوی زاڵ بوونە
لەنێو بۆتەی خەباتا ئەوە هەر شەرتی قاڵ بوونە
لەنووچدانو هەڵئەنگوتن نییە ترسی گەلی کوردان
وەکو ڕێگەی خەباتی خۆی، شکانی تۆی لەلا ڕوونە
لەگەڵ کاروانی ڕزگاری گەلان ئەڕوا بەچالاکی
لەسەختی ڕێ، لەدووری جێ، و دووری دوژمن نیە باکی
نەکۆڵدانو نەلادانو نە وێستانی نییە هەرگیز
پشو نادا هەتا نەبڕێ ڕەگی چەوسانەوەو ماکی
زیندانی ئەبو غریب ١٩٤٩



## خۆشەویستەکەم

ئەم چەند شیعرەم لەناو کۆمەڵێ کاغەزە کۆنا دۆزیەوە، سەرەتای نامەیەکی دڵداری‌یە کەوا دیارە نووسەرەکەی بە ناتەواوی جێ‌ی هێشتووە.

۱۹۳٥/۱۰/۱۲ بەغدا

-ر-

خۆشەویستەکەم، ئارامی گیانم
بینایی چاوم، هیوای ژیانم
چیتە تۆ وەها کەوتویت بە قینا
تەنیا جێت هێشتووم لەچۆڵی ژینا
یاران هەروەها پەیمان شکێنن؟
هەروا بێ قسەو وا بێ بەڵێنن؟
یا هەر تۆ، هاوار، تۆش لەبەختی من
راستی‌و پەیمانت لێ بۆتە دوژمن
شەوێ بەیادی ژینی ڕابووردوو
بەیادی گوڵی عومری بابردوو
سەرێ بکێشە هەوارگەی وێران
کە تاریکترە لەدیدەی کوێران
بزانە مەستی شەرابی چاوت
گیرۆدەی داوی ئەگریجەی خاوت
کۆست کەوتووەکەی کۆنە هاودەمت
چۆن بۆتە یاری دێرینی خەمت

چۆن ماری دووریت تەزاندویەتی
ئازارو دەردت ڕزاندویەتی
لەجێ‌ی تۆ خەمی گرتۆتە باوەش
زاری‌و بێ خەوی بوونە برابەش
نەء نەء گیانە بەقسەم نەکەی
ئەگەر مردیشم سەرم لێ نەدەی
نەوەکا پرتەو بۆڵەی ویژدانت
لێتی تاڵ بکا ماوەی ژیانت.
تۆ بژی بۆ خۆت بێ‌خەم‌و بێ باك
منیش ڕەنجەڕۆ بۆت ئەچمە ژێر خاك
یەکەم دڵدار نیم بەم جۆرە بمرێ
تۆش یەکەم یار نیت ئەم ڕێ‌یە بگرێ
*

## نەورۆزی من

پێم ئەڵێن نەورۆزە ئیمرۆ،
رۆژی جەژن‌و خۆشی‌یە
وەختی هەڵپەڕکێ‌و سەمایە،
مەوسمی تەڕپۆشیە
دەشت‌و دەر گوڵ پۆشە، ئەم
رەش پۆشیەت بێ هۆشیە
مۆنی رووت بێ جێ‌یە،
عالەم کەیلی بادەنۆشی‌یە
من ئەڵێم نەورۆزو شادی‌و
جەژنی دیل ئازادی‌یە

# ئەی مانگ لێڵ نەبی بەو میوانانە

ئەی مانگ! کەلەلا، دۆستی دێرینم!
ڕۆشنکەرەوەی شەوگاری ژینم
رازێنەرەوەی بەزمی دڵداران
جێ ڕازی دڵ و سکاڵای یاران
هاودەم، هاودەردی لەخەو بێزاران
واتێ ئەگەی کە (دەستی بەدکاران)
کەم ئەکاتەوە ئەشقەکەی جاران
تۆ ئێستەش هەر ئەو دۆستەی جارانی
هاوڕێ و هاودەمی دەستەی یارانی
*　*　*
خوێنمژی گەورەی سەرمایەداری
لای وایە ئەبیە قەڵای رزگاری
شایی و بەزمێتی ئەتریقێتەوە
هەنگی لەدارا- دۆزیوەتەوە
برسی و بەشخوراو، پاڵەو کرێکار
بالەم زەمینە پێشی بکەم بار
دنیایەکی تر، بۆ هەزاران ساڵ
بۆ چەوسانەوەو شەڕ ئەکا بەماڵ
(والستریت)[1] و (ستی)[2] شڵەژاو.
کۆمپانیای نەوت لەدەست دەرهێنراو
بانقی کەساسی ماڵ تالان کراو!!
سەرمایەداری ڕەنج بەبادراو!!
ئاغای هەژاری زەوی لێ سەنراو!!
سەرلەنوێ لەمانگ، لە ئەستێرەکان
دای ئەنێنەوە بازاڕو دوکان!؟
*　*　*
هەموو زانین و بەرهەمو کەڵکی
بەکار ئەهێنن بۆ تەفرەی خەڵکی
نایەڵن ناوی (شۆڕش) و (خەبات)
بەبیری کەسا هەر گوزەر بکات
سەرمایەداری (کارخانە) براو
زۆرداری بەشەق (لێرە) دەرکراو
بێ ترسی گەل و بروخێ و بڕێ
بێ ئەوەی کەسێ خەبات کا دژی
هێندە پارەو پول کۆئەکاتەوە
داخی (ئەرزە بۆر) بیرئەباتەوە
خۆی ئەکاتەوە بەخانی خانان
ئەگەڕێتەوە دۆخیانی جاران
جارانی (گەلان) کاڵ و ئەگەییوو
ئەو سایەی (زەمین) موڵکی زۆردار بوو
(دونیا) بەهەشتی سەرمایەدار بوو
ئەمانە هەمووی خەیاڵ پڵاوون!
کۆشکی سەر لمن، بلقی سەر ئاوون
خەوێ بوو دیترا، دەوری بەسەرچوو
ناگەڕێتەوە پاشەو پاش مێژوو!!
ئەی مانگ　لێڵ نەبی بەو میوانانە
هاتنە لات تاسەی کۆنی ئینسانە
ئەوەتەی بەشەر ڕووخساری دیویت
هاوڕێی شەویەتی تریفەی زیویت
ئاواتە خوازە ڕۆژێ پێت بگا
باشتر بتناسێ، چاکتر تێت بگا
(ئارمسترونگ) و (ئەلدرین)، هاوڕێ کەی
سێ پەیکی ئاشتین ئازاریان نەدەی
ئازان، چالاکن، بەسزمانن
لەفاکو فیکی (نیکسون) نازانن
بەدڵی خۆش و پڕ لە هیواوە
نامەی (دایکیان)[3] بۆ کوڕ هێناوە
*　*　*
(نیکسۆن) و (شەڕ) و (وال ستریتی)
(بنتاگون)[4]، (سیا)[5] و پیلان و فیتی
ڕەنجی گەلان دز، سەرمایەداری
ئیمپریالیزم و زوڵم و زۆرداری
زۆر زووتر لەوەی بگەن بە ئاوات
تیری خەباتکەر لە باڵیان ئەدات
بازووی جەماوەر گیانیان دەردێنێ
نایەڵێ ڕەگ و تۆیان بمێنێ
ئەو هاژو هوژە گیانەلاویانە
زەلکاوی مێژوو جێگەی ئاویانە
هەتا پێشکەوێ سەرمایەداری
زۆرتر نزیکە لەڕۆژی تاری
ڕەنجی کرێکار، زانین پێشکەوتن
بەکار ئەهێنرێن بۆ ژین- خۆشکردن
بۆ بنیات نانی چەشنە دنیایە
هێند خۆش، بەخەریش بە بیرانایە
دنیای گەلان تیا بەنیاز گەیشتوو
دنیای بەگەل دووی یەك ئاوات کەوتوو
دنیا پڕ خۆشی، دنیاپڕ شادی
بێ چەوسانەوە پڕ لە ئازادی
وەك برا بژین پێکەوە گەلان
شارستانیەتی بگاتە ئاسمان
ئەوساکە مانگ و زۆر ئەستێرەی جوان
ئەکرێنە مۆڵگەو هەوارگەی ئینسان
ئەڕازێنەوە بەدەستی (زانین)
بەراستی ئەبنە بەهەشتی بەرین
ئەوساکە　ئەی مانگ! ئەشقی کۆن و نوێ
تێکەڵاو ئەبن هەروەك چەم و زێ
تۆی هەتا ئێستە دۆستی دوورەجێ
بۆ بەزمی یاران ئەبیە خانەخوێ

بەغدا ١٩٦٩/٧/٢٩



(1) والستریت: ناوی شەقامێکی تەنگەبەری (نیویورك)ە.
(2) ستی: شەقامێکی (لەندەن)ە و نیشانەی کاروبارو دەسکەوتی (ماڵی) بەریتانیایە.
(3) لەسەر ئەوتیورەی کە ئەڵێن مانگ لە ئەرز جیابۆتەوە.
(4) بنتاگۆن بینایەکی پێنج سووچە لە واشینتۆن وەزارەتی دیفاعی ئەمریکای تێدایە.
(5) سیا: دایەرەی جاسوسیەتی ئەمریکا.

# بەرەو رووناکی

لەناو جەرگی تاریکیەوە
دەست بەکەلەبچەو تەوق لەمل و زنجیر
لەپێ
لەکانگای نەزانی و هەژاریو دیلیەوە..
کەوتومەڕێ هاتوم ئەڕۆم بەرەو روناکی
* * *

پشتم داپزاوی جەزرەبەی قەمچییە
ناوچەوانم تفی پیادێتە خوارەوە..
پێم شەلی دارکاری‌یە
فرمێسک لەچاوما قەتیس ماوە
پێستم بەسەر ئێسکما وشك بۆتەوە..
بەلأم بەدلێکی وەك پۆلاوە
رێم گرتۆتە بەر ئەڕۆم بەرەو روناکی..
* * *

ماندووم و رێگاکەم دوورە
برسیم، دوژمنەکانم تێرن
روتم و ئەوان پۆشتەن
بێ‌هێزم و ئەوان بەدەسەلأتن
من دەستو پێ بەستراومو ئەوان بەرەلأن
لەگەڵ ئەوەشا بەویستنێکی نەگۆڕەوە
گیانێکی نەبەزو زاتێکی مەردانەوە
ئەڕۆم بەرەو ڕوناکی..
* * *

ئەزانم..
زۆرچاك ئەزانم چ ڕێ‌یەکی سەختم لەبەرە
چ دەردو ئازارو ئەرکێکم لەسەرەو



ئەزانم چەند دوژمنی
زۆردارو
خوێنەخوێ ڕێم لێ
ئەگرن..
بەلأم نە سەختیی
ڕێگە، نە سامی
تاریکیی بێ‌پایانی
دەوروپشتم
ئەزۆری و زۆرداری
دوژمن
ئەوەندەی تۆزێ
کارناکەنە دڵم
سەرێکەو هێناومەو
نایگێڕمەوە ئەڕۆم
بەبێ ترس
بەرەو روناکی..
* * *

ئەزانم دوژمنەکانم چ
بلیمەتێکن لەئازاردان
و کوشتنا
هەمیشە ئەو داخانەم
لە پێش
چاوە کە
بەناوچەوانی باو و
باپیرەمیانەوە ناوە
ئەزانم چ
شەیتانێکیان
لێ دەرچوو لەویژدان مراندنو
گیان کوشتنا..
بەلأم لەهەموو داخێ لای من بەئاسۆرتر
داخی دڵم و لە هەموو بەندیخانەکانی ئەوان
تاریك ترو پڕ ئازارتر، ژیانی ئێستەی خۆمە،
بۆیە هێز نیە بموەستێنێ، دەسەلأت نیە لامدا
لەڕێ،
ڕۆیوم و ئەڕۆم بەرەو روناکی..
* * *

ئەزانم ڕەنگە ئەشگەمە ئامانج
ڕەنگە لەیەکەم قۆناغا بکوژرێم
زۆر ڕێی تێ ئەچێ لەرێگا بمرم
بەلأم بمرمو بەرەو روناکی بڕۆم،
لەهەزار ژیانی ناوتاریکی چاکترە
بۆیە هەر ئەڕۆم بەرەو روناکی..
* * *

نا.. ئامن هەرخۆم نیم،
بەتەنیا نەکەوتومە ڕێ،
هەزاران هەزاران هەزارین
هەمو کەرامەتی پلیشاوەمان
هەستاوەتەوە
پشتی چەرم بەدار فڕێدراومان
هاتۆتەوە سوێ..
ئابڕوی تکێنراومان ئەنەڕێنێ بەسەرمانا..
هەقی هەزار ساڵ خوراومان
تێمان ئەخوڕێت
ویژدانی نوێنراومان ڕاست بۆتەوە
گیانی مرێنراومان ژیاوەتەوە
هەرچی زۆرێ لێمان کراوە
لەباوك و باپیرمان کراوە
هەرچی دەردو ئازارێك
لە دیلی و ئەزانی و هەژاریمان دیوە
بوەتە هێزی دڵ و گیان و
ورەمان هەموو بەجارێك،
ئەمجارە هەموو بەجارێك،
ئەڕۆین بەرەو روناکی..
* * *

بەرەو روناکی ئەڕۆین و
بێ گومان بەکوێرایی چاوی هەموو دوژمنان
سەرەڕای هەموو
سەختی و توشیو مەترسی و تاریکی ڕێ
وبان،
گەیوینو ئەیگەینێ..

# کوێرەوەری

ڕۆژێکی تا بڵێیت گەرم بوو، قرچە قرچەی نیوەڕۆ، دوو سێ لادێیی ڕەش‌و ڕووت لەسەر بەردە نوێژی مزگەوتی دێی (ک..) لەژێر سێبەری دارە ڕەشەکەیا، کە چەوساندنەوەو ناخۆشی‌و ژیان‌و مردنی هەژارانی وەك ئەمانی دی بوو، دانیشتـ ون. سکالایان ئەکرد، گلەییار ـ لە دەست چڵێسی‌و تەماعکاری سوو خۆر، دڵسەختی‌و خوا نەناسی خاوەن مڵك، برسێتی‌و ڕووتی‌و دەستەنگی‌و بێ دەرامەتی خۆیان.

یەکێکیان کە بارستایی عومری لەسەر پشت کەلەکە کراوی چەماندبوویەوە دەستە زبرە ڕەگ‌و دەمار دەرکەوتووە، فرمان شەقارتێ خستووەکەی هێنا بەڕیشە سپی‌یەکەیاو سەری هەڵبڕی‌و چاوە کزەکانی بڕییە ئاسمان وتی:

-هەمووی هەر لەخواوەیە! خوایە خراپتر نەدەی شوکرین بە بەشت.

یەکێکی کەیان کە هەرزەکارێکی کەڵەگەتی تێکسمڕاو بوو بە تووڕەیی‌یەکەوە بەرپەرچی دایەوە وتی:

-نەء مام هەسەن! وا مەڵێ گوناهت ئەگات، ئەم فرمانانە هیچیان لەخواوە نین، ئەمانە ناهەقین! جەورن زۆرداریـن، هەموو دەستکردی بەندەن هەموو تاوانی خۆمانە کە قبووڵی ئەکەین. گوناهی ئێمەیە کەلەژێر ئەم باری گرانی‌و ناهەقی‌یەدا سەر شۆڕو مل کەچین!

مام هەسەن لەبەر خۆیەوە ئەی وت: ئەم هەتیوە شێتە قسەکانی زۆر لەڕاست ئەچن، وەختە وام لێ بکا بچمە سەر باوەڕی "پێشینان وتوویانە قسە یان لەشێت یان لەمناڵ" ئەم لەم بیرانەدا بوو کوڕەش تا ئەهات دەنگی بەرز ئەکردەوەو پڕشنگی ناشکوری‌و نارەزایی چاوی گەشتر ئەبوو. تا لەپڕ وەکو شتێ قسەکەی لە گەروودا تاسا.

هەر سێ لادێی‌یەکە پێکەوە چاویان بڕیە ئەو ڕێیەی لەسەر گردەکەوە شۆڕ ئەبووەوە بەمل دێ‌یەکەیاندا دییان، هەروا لەداوێنی گردەکەوە ڕووەو مزگەوت دوو سوارەی "ژەندرمە" بەرەو دووا دێن.

هەرسێ کابراکە لە یەك وەختا سەروو تەماشای مانادارى یەکتریان کرد، وەتا گەیشتنە لای ئەمان‌و بێ سڵاو کردن یەکێکیان دابەزی، هەریەکەیان هەزارویەك پرسیاری بێ وەرامی لەبابەت هۆی هاتن‌و نیازی ئەم دوو ژندرمەیەوە لەخۆیان کرد. ژەندرمەکە هەرکە دابەزی بەشێوەی‌یەکی کە هەر ئەمری کردبێ وتی:

- ئاوەرن کوڕە یەکێکتان ئەم وڵاخەم لێ بگرێ وە بەبێ ئەوەی تەماشای لادێییەکان بکات کە جگە لە هەرزەکارەکەیان دووانەکەی تریان وەکو کێچ ڕاپەڕین‌و مام هەسەنیان پەلاماری جڵەوی وڵاخەکەیدا وتی:

-یەکێکیشیان لەگەڵ ئەم ژەندرمەیە بڕوا ماڵی سۆفی هەسەنی ئەولای نیشان بدا تا من لێرە ئەختێ ماندوویی خۆم ئەحەسێنمەوە.

کابرای پیرە وا چەمایەوە هەر ئەوە بوو پەل وڵاخەکەی ماچ ئەکرد، وە بە شپرزەیی‌و سەر سوڕمانێکەوە وتی:

-سۆفی هەسەنی ئەولامنم قوربان کەوام لە خزمەتتاندا!

ژەندرمەکە وەك قەڵای دوم دومی گرتبێ بەفیزێکەوە چاوی بەدەورو پشتی خۆیا گێڕاو بەشێوەیەك کە قیز کردنەوەو سوکی لێ ئەتکا بەپیرەی وت:

-تۆیت! تۆی ئەو سوارچاکەی یاخی بووە لەمیری؟ هەهەها کوڕە عەلی-ڕوی کردە هاوڕێکەی- ئاگات لەخۆت بێ، مەحمود خدر زیندوو بووەتەوە؟ دەك بەڵام لێدایت. ئابێنە کەلەپچەیە بێنە بیکەمە دەستی ئەم ڕیش کلکە سەگەی، سەکسارە!.. " کەلەپچەکەی لەهاوڕێکەی وەرگرت‌و کردیە دەستی مام هەسەن‌و ڕووی کردە کوڕە هەرزەکارەکە، کەوا لەدوور ڕاوەستابوو بێدەنگ، بێ ئارام ڕووگرژ سەیری ئەم مشت‌و مڕەی ئەکرد- وتی:

ئاکوڕە بڕۆ بە کوێخا بڵێ مریشکێکمان بۆ سەربڕێ‌و زوو بیکەن بە قبووڵی ناتوانین زۆر بەنگ بین. کوڕە بێ‌ئەوەی ورتەی لەدەمەوە بێ، پشتی کردە ژەندرمەکە تفێکی کردە ئەرزەکەو ڕووەو کەژ لێیدا ڕۆیشت کابرای ژەندرمە کەهەرگیز چاوەڕوانی ئەم ڕەفتارە ئەبوو تێ‌ی خوڕی! ئاکرام باوگاو! ئەڕۆیت تا ئاودەمت بەزللە سوێر کەم‌و فێری ئەدەبت بکەم! کوڕە دایە کەژ. لادێیی سێ‌یەم لە ژەندرمەکە هاتە پێشەوە وتی:

قوربان سەغڵەت مەبە، ئەو هەتیوە هەروا شێتۆکەیە، هەر ئێستە خزمەتکاری خۆت ئەچن‌و بەکوێخای خاڵۆم ئەڵێم" ئەمەی وت بەرەو ماڵ ڕای کرد.

پاش دوو سات، دووای ئەوەی تێر لەوەڕان، دوو ژەندرمەکە سواربوون‌و سۆفی هەسەن بەچەکەچەکی کلاشێکی شڕەوە بەدوویانەوە، هەرچی خەڵکی ئاوایی‌یەکە هەبوو، بوونە تکاکار، وە لە ژەندرمە "بەگ" دا کول‌و کافر بوون کە بیەڵێ سواری گوێ درێژێك ببێ، بێ هودە بوو. بەم جۆرە کەوتنە ڕێ ئەوان سوارو سۆفی هەسەنیش نەك هەر پیادە بە قۆناغە تفەنگ ئەمەندەیان ماڵی بەشان‌و ملیا کە دووا ئەکەوت ناچار بوو خۆی بەکێش بکات لەگەڵ ئەوان دەرچێت. ئەمەش نەك هەر تەنیا لە ترسی قۆناغە تفەنگ، بگرە لەترسی خنکانیش چونکە ژەندرمە بەگ گوریسێکی ئاڵانبووە ملی‌و سەرەکەی تریشی بەستبوو بە قەلپووزی زینی وڵاخەکەیەوە. دوای سێ سات کەگەیشتنە نوختەکە سۆفی هەسەن خۆی لێدا بەئەرزا، ها ئێستە مردووە ها هەزار ساڵی‌کە، دوو سێ ساتی وامایەوە ئینجا هاتەوە سەر خۆی. هاتەوە خۆی بۆ ئەوەی هەستی ئازاری قاچ‌و قول‌و شان‌و ملی بکات، هەریەکە لەدووسێ لاوە بریندار بوون. ڕوانی وا لە شوێنێکی تاریکا لەسەر شتێکی تەڕی ئەرم کەوتووەو لەلای ژووروەوە مشەمش دێت، کە ئەختێ زۆرتر هاتەوە سەرخۆی، وەباشتر چاوی بەتاریکی جێگەکە راهات تێ‌گەیی کە لە تەویلەیەکا فڕێ دراوە. بەزۆر خۆی بەکێش کرد بۆلای دەرگاکەو لە بەینی شیشەکانیەوە ڕوانی‌یە دەرێ دی وا زەلامێ بە تفەنگێکەوە وەستاوە لێ‌ی پاڕایەوە وتی:

-کاکە یاساووڵ بیکە لەڕێ‌ی خوادا قومێ ئاوم بگەیەنەرێ خنکام! "مام هەسەن بەحەپاساوی چاوی تێ بڕی

کەدی تفەنگەکەی داناو ... پێشەوە، دەرگای تەویلەکەی ... کردەوە وتی:

-خالۆ وەرە ئەوە ئاوە ... بخۆرەوە!" کابرای تایەن ... پێشەوە بڕوای بە گوێی ... نەکرد تا ژەندرمەکە دەستی گرتو بردیە سەر حەوزەکەو بەدیاریەوە راوەستا تا دەست ... دەمو چاوی شت، تێر ئاوی خواردەوە، کە باش هاتەوە سەر خۆی بەژەندرمەکەی وت:

-نازانم بوێرم لێت بپرسم کە بۆچی ئەم دوو ژەندرمە خوا نەناسە وایان لێ کردم، بۆچی هێناومیانە ئێرە؟ هیچ تاوانێ لەخۆما شک نابەم!" ژەندرمەکە وتی:

-بۆ ئاوێری منیش کوڕی مسکێنێکی وەکو تۆم، خاوەنی جووتو بەرەو ئاژەڵو زەوی خۆمان بووین، زۆردارو سوخۆر هەمووی لەدەس دەرهێناینو تەفرو توناى کردین، وە منیش بەناچاری ئەم بەرگەم لەبەر کرد. بۆ مەسەلەی خۆت ئەپرسی ئەوی راستە نازانم بۆچی هێناویانی، ئاخۆ چەدەستدارێ شکاتی لێ کردویتو زابتەکەمانی هەنووە. بەیانی دەر ئەکەوێ هەر ئەوەندە ئەڵێم خوا ئەم دەزگاو دوکانە بپێچێتەوە. ئێستەش ئەوەکا یەکێ بێت بەسەرا، بامنیش تووشی گاشە نەبم هەستە بچۆرەوە شوێنەکەی خۆت. تەختەکەی خۆشمت ئەدەمێ لای دەرگاکەوە داینێ لەسەری بنو، تەویلەکە زۆر پیسە با شتێکت پێوە نەدا.

سۆفی هەسەن تەماشەیەکی ژەندرمەکەی کرد، دوو دڵۆپ فرمێسکی سوپاسو پێزانین بەری چاوی گرتبوو پێی وت:

ئا کوڕم عەمر درێژ بی هەر ئێستە ئەچمەوە شوێنەکەی خۆم، من فێرم، فێری نوستنی ناو تەویلەم، کاول بووەکەی خۆم کە ئەوەشم پێ رەوا نابینرێت، لە تەویلەی وڵاخەکانی ئێوە خۆشتر نیيە ژیانی وڵاخەکانتان لەچاو ژیانی خۆما پاشایی‌یە ئێمە فێری ژینی سەگێ هەموو راهاتووین. هەزاران ساڵە لە پیسیو چڵکنیو نەخۆشیو برسێتی‌دا ئەتلێینەوە، لەگەڵیان بووینە دۆستی گیانی، لەگەڵ هەژاریو دیلی‌دا کۆنین، کۆنی دنیا؛ زۆردار بەرەچەڵەکی پشتاو پشتماندا هاتۆتە خوارەوە. هەزاران ساڵە ئێمە هەر هەوڵ ئەدەینو خەڵك ئەیخوا! هەزاران ساڵە ئێمە هەر ئەچێنینو خەڵك ئەی دروێنتەوە، هەزاران ساڵە کردەی ئێمەیەو بردەی زۆردار. پشتاو پشتمان لەم خاکەدا هاتۆتە دنیا، لەم خاکەدا رەنجی‌داوە، لەرێگەی ئەم خاکەدا کوژراوەو لەم خاکەدا نێژراوە هەزاران ساڵە ئەم داستانە دێتو ئەچێو ئەم دەزگاو دوکانە ئەگەرێ، هەمیشەش هەر مردوومان لە زیندوومان زۆرتری پێ براوە، زۆرتر لەم خاکەدا بەشدار بووە. هیچ نەبێ ئەو گۆڕیچەیەکی بۆ خۆی داگیر کردووە! بەلام زیندوومان نەخاکمان هەیە نەزەوی نە ژنمان هی خۆمانە، نە سەر، نەماڵ "وەك ئەم قسانە ئازاری لە لەشیا نەهێشتبێو هەموو داخی دڵی رەوانبێتەوە. بە چمکی سورانی‌یە شرەکەی دوو دڵۆپە فرمێسکە قەتیس ماوەکەی چاوی سڕیو زۆر لەسەرخۆ سەربەرزو بێ باك چووەوە ناو تەویلەکە و دەرگاکەی توند لەسەر خۆی پێوەدا بەلام تا خەوی لێ کەوت هەر بیری لەوە ئەکردەوە کە چۆن قسەکانی لەگەڵ کابرای یاساوول کردی لەقسەی خۆی زیاتر لەهی هاوڕێ هەرزەکارەکەی ئەچوو کە بەر لەهاتنی دوو ژەندرمەکە پێی ئەوتن:

هۆی هەموو ئەم ئازارو ئەرکە خۆمانین، هۆی سەرگرتنی ئەو هەموو جەورە ناتەبایيو نەزانیو بێ هۆشیو کەمتەرخەمی خۆمانە".



ڕۆژ دوو ڕمی لەگەل بەرز بووبووە وە کە دوو ژەندرمەکەی دوێنێ هێنابوویان دەرگا کەیان کردەوەو کەلەپچەکەیان کردەوە دەستیو پێش خۆیان دابۆ بەر دەرگای ژووری زابتی ژەندرمە. دوای دوو ساتێ بە پێوە ڕاوەستان. بانگ کرایە ژوورێ. کوڕێکی کورتە بنەی سوور فلی قەلەو لەپشت مێزێکەوە دانیشتبوو. کە ئەمی دی دەستێکی خرپنەی هێنا بەو دوو چلە توورکەدا کە هەموو قژی سەرە کەچەلەکەی بوون. وە بە تووڕەیی یەکەوە بە سۆفی هەسەنی وت:

-وەرە ئەم لاوە کەر باب! پشت مەکەرە بەگ. سۆفی هەسەنی حەپەساوی داماو کە خۆی لادا چاوی کەوتە قەلافەتی پتەوو کەلەگەتی (م. بەگ) ی کۆنە ئاغای دێی- کە لەو ساتەدا قرخە قرخو کۆکە کۆکی هەر ئەوە بوو ژوورەکەی ئەلەرزان. خەریکی بەلغەمێ بوو لەوانەی م. بەگ لەجۆری دەرهێنانو فڕێ دانیا شانازی یەک ئەنوێنێ کە هیچ (فنانێ) ئەو شانازی یە بەشا ئەسەریەوە ناکات.

سۆفی تەماشایەکی وای کرد کە یەکێ بەو لەشە بێ جورەو چاوە کزانەو بەو بێ هێزیو مسکینیو مزووری ڕاهاتوویی یەوە هەر ئەوەندە ئەتوانێ، لە تەماشا کردنێکا، نزمیو پەستیو نابایەخی بەرامبەرەکەی دەرخات. زابتەکە بە ئەدەبێکی زۆرەوە پرسی:

-ئەمەتە بەگم؟

(بەگم) کە بەهێزێکی هەرقلی بەلغەمەکەی دەرهێناو وەك تابلۆ یا نیگارێکی ڕەنگین بەدیوارەکەی بەرامبەریا هەلواسی وە گەرووی ئەختێ پاك کردەوەو ئەموستی گەورەی ڕاستی خستە سەر پەڕەی ڕاستی لووتیو فمێکی کردە لای چەپ، و ئەموستە گەورەی چەپی خستە سەر پەڕەی چەپی لووتیو فمێکی پالەوانانەی تری کردو لای ڕاستی ئەرزی ژوورەکەی سواغدا، وە زۆر لەسە ڕخۆ بەدەسەسڕەکە دەمو لوتی لە پاشماوەی چلمو تفو بەلغەم پاك کردەوە ئینجا وتی:

-بەلێ ئەم سەگبابەیە!

زابتەکە ڕووی کردە سۆفی هەسەن وتی:

-کوڕە پارەی بەگت لایە بۆ نادەیتەوە؟ ها! مام هەسەن وەك زۆر چاك خۆی ئامادە کردبێ بۆ ئەم ئەبەردە لەسەرخۆ وتی:

-قوربان خۆم بەقەرزاری نازانم..

زابت بە تووڕەیی یەکەوە وتی:

-من ئەم قسە قۆڕانە نازانم یا پارەکەی ئەدەیتەوە یا لەژێر دارا پشتت ئەشکێنم. ڕاوەستا وەك بیەوێ بزانێ ئەم قسەیەی چە کارێ لە گوێگرەکەی ئەکات.

بەلام سۆفی هەسەن بێ ئەوەی بشلەژێ وتی:

-قوربان وتم پارەی لام نی یە وە ئەگەر ئەشلێ پارەم لایەتی: بابچێ شکاتم لێ بکات ئەوە دەرگای مەحکەمە لەسەر پشتە! وادیار بوو وشەی (مەحکەمە) چەکی نهێنی سۆفی هەسەن بوو بۆیە بێدەنگ ڕاوەستا نەك هەر چاوەڕوانی ئەوە بوو کە ناوی (مەحکەمە) بەرامبەرەکەی وا لێ بکات بەرەللای کا، بەتەمای ئەوەش بوو زابتەکە گەلێ لێی بپارێتەوەو دلی بداتەوە لەڕووی ئەو معامەلە ناشیرینەوە کە دوێنێ لەگەلی کراوە، بۆیە مەپرسە چەند واقی وڕما کە "زابتەکە" دایە قاقای پێکەنینو وتی:

-هەهەها مەحکەمە! مەحکەمە کەواتە ئێمە ئەبێ لێرە دابنیشین ئەسپێ بکوژینو جەنابیشتان بچن پارەی خەلك بخۆن وە بە بەرچاومانەوە بێنو بچن ورتە نەکەین ئەمە چی یە دەرگای مەحکەمە لەسەر پشتە!؟ بەو خوایە کەمە دەرگای مەحکەمە لەسەر پشت بێ یا داخرابێ، هەر ئێستە ئەو پارەیەی (بەگ) نەدەیتەوە ئەمەندەت ئەکوتم تاماوی ناوی مەحکەمەشت بیر نەکەوێتەوە بەخوا شتێکی باشە! ها؟

سۆفی هەسەن وەك یەکێ لەشەڕێکی ژیانو مردنا دەستی نابێ بەپەلە پیتکەی دەمانچەکەیا کە دووا گوللەی بنێ بە دوژمنە دەست بەخەنجەرەکەیەوەو ئەتەقی بێ. ئاوها سەرسامو دەستە پاچەو وڕە بەردراو چاوی بڕیە زەوی یەکەو نقەی لەخۆی بڕی. زابتەکە ئەڕانی بەسەریا وتی:

-کەڕی؟ کەری؟ چی؟ ئەلێم هەر ئێستە پارەکە ئەدەیتەوە ئەگینا لەژێر دارا ئەت ڕزێنم.

سۆفی هەسەن وەك ئەم هەڕەشەیە خۆی لەبیر بردبێتەوە دەستی کرد بە بەر باخەلیا بەلام لەباتی ئەوەی پارە دەربێنێ دەستی لەیەکێ لەکونەکانی باخەلی کەوا شڕەکەیەوە هاتە دەرێ. بە دەنگێکی ئەسپایی پڕ پاڕانەوەو سۆز وتی:

-قوربان بەسەری تۆ شکی پێ نابەم نیمە! وەللا نیمە! وەللا پارەی لام نی یە!

بەگ وەك لەم گفتوگۆ بێسوودە بێزار بووبێ لە جزدانەکەی کاغەزێکی قەدکراوی دەرهێناو خستیە بەردەمی زابتەکەو وتی:

-فەرموو ئەمە سەنەدەکەیەتی! دەوەرە چاکە لەگەل ئەم سەگبابانە بکە. بەسەری تۆ ئەمە پێنج سالە ئەم پارەیەم لایەتی سەرەڕای ئەوە کەنامداتەوە ئێستەش ناچێتە ژێری ئەمسال چەند لادێیی یەکی خوێڕی گەلۆری وەك خۆشی لێ هەلگێڕامەوە؛ دێیەکەیان چۆل کردم! وا ئەزانن هەقی من هەروا بەئاسانی ئەخورێت نازانن حکومەت هەیە!؟.. بەڕاستی خۆ ئەگەر ئێوە ئەبوونایە ئەم ڕەشو ڕووتانە ئەیان خواردین! ڕەحمەت لەگۆڕی ئەوەی وتوویە (بوز بەلەری) ئەمانە گوڕیان ئەوەیە هەر بەشەقو دار لەگەلیان بدوێیت، بەشیان ئەوەیە هەر برسی بن ئەمسال دەغلو دان تۆزێ پارەی کرد هەموو چاویان لێ سوور بووە!

مام هەسەن کەدی زابتەکە خەریکی خوێندنەوەی سەنەدەکەیە ئەمەی بەهەل زانی سەری ڕازی دادا:

-"میرم بەسەری تۆ ئەو دەلیرەیەی لەو سەنەدەدا نووسراوە تا ئێستە حەوت جارم داوەتەوە ئەسلەکەشی دوو لیرە بوو بۆ کفنو دفنی جوانەمەرگەکەی کوڕەم لێ سەند، والێم بوو بە خوێنی سیاوەشو هەر نابڕێتەوە. تاوای لێ هات پار خۆت ئەزانی بێ دەرامەتی بوو، باران نەبوو؛ دوو سێ سەر مەڕم بوو هەموو فەوتان. خۆم لەبەر پیری ئەمتوانی تەقەلای جاران بدەم هیچ شتێکی ئەوتۆم بۆ نەهاتە بەرهەم ئەم (م. بەگی) حازریەش ئەك سێ یەك نیوەی لێ سەندم لەباتی ملکانە ئینجا هەلی پێچام بۆ قەرزە لەبڕانەوە نەهاتووەکەی گەلێکی لێ پاڕامەوە وتم:

خوات بێ من ئەم هەقەم حەوت جار داویتەوە وازم لێ بێنە سالەکەی سال نی یە لەبرسا خۆمو مالو منالم مەکوژە! کەچی پێی وتم چاوت دەردێنم وات لێ ئەسەنمەوە ئینجا لەدێیەکەشم دەرت ئەکەم "منیش چارم نەما لەدێیەکەی ڕامکردو گواستمەوە دێی (گ) وا ئێستەش وازم لێ نایەنێ گەڕی تێ ئالانووم. بەلام خوا لەسەر هەقە".

م. بەگ لەوە زیاتر خۆی پێ ڕانەگیرا دەستی داوەشانەوە تا هێزی تیابوو مالی بە ناودەمی کابرای پیرەداو وتی:

-سەگباب! سەرەڕای ئەوەی هەقم ئەخۆیت قسەشم پێ ئەلێیت!.. زابتی ژەندرمەش بەدووی ئەوا سۆفی هەسەن وەختێ بەخۆی زانی، زابتەکە بەلەقەوە هاتۆتە سەر ورگیو بە م. بەگ ئەلێ "قوربان تۆ خۆت سەغلەت مەکە من ئەزانم چۆن ئەم سەگبابە تەمێ ئەکەم".

سۆفی هەسەن کەوتە هاوارو داد بەلام زابتەکە تا خۆی ماندوو ئەبوو لێی ئەبووەوە، ئەوسا دەستی لێ هەلگرت. م. بەگ ئەمەی بەهەل زانی ڕوی کردە کابرای پیرەمێرد کە هێشتا هەلنەستابووەوە وتی:

-دیت من چۆن هەقی خۆم ئەسێنم. لەکەلی شەیتان وەرە

خواریٔ، لەمە زیاتر خۆت بە تێهەڵدان مەدە. مانگانەکەتم بەریٔ وازت لیٔ دێنم.

سۆفی هەسەن لاسارانە وتی:

-نایدەم، بمکوژن نایدەم! هیچت لام نی‌یە! هیچم نی‌یە.

زابتەکە بەتووڕەیی‌یەکەوە دای لەزەنگ، دەمودەست چەتەوولێ کردی بەژوورا، پێی وت:

-ئەم کەری کەریابەم بۆبەرە تا ئاقڵی ئەکەی ئەیەیتەوە.

"ئەویش دەستێکی‌دایە پەلی سۆفی هەسەن کە وەکو پەلاس کەوتبوو بەشەقێکو زللەیەك فڕیٔی دایە دەریٔو خۆشی بەدوویەوە".

دووای ئەختیٔ بیٔ دەنگی م. بەگ رووی کردە زابتەکە وتی:

-ئینجا تۆ ئەزانی بەم جۆرە ئەبیٔ پارە لەگەرووی ئەم سەگبابانە دەربنایەت؟ پێریٔ پرسی ئەو قاتە کەمم کرد کە هەندیٔ پارەم لای دەپانزەیەکی وا هەیە بۆم بسێنیتەوە ئەڵیٔ دوای ئەوەی لە مەحکەمەشدا ئەی کەی بەمال بەسەریانەوە ئەبیٔ دوو شایەتی لادێیی وەکو خۆشیان بهێنیٔ شایەتی بدەن کە ئەتوانن قەرزەکە بدەنەوە ئەوسا مەحکەمە بۆتی حەپس ئەکا، منیش تیٔگەیشتم ئەمە بۆمن دەست نادا چونکە جاریٔ لادێیەکان هەر ئەوەندەیان بەسە کە بزانن حکومەت لایەنی من ناگریٔ ئیتر قورتم هەڵدەهێننەوە وە ئەگەر بزانن مەحکەمە هیچیان لیٔ ناکات وەحەپس ناکریٔن ئەوە هەر بە تەواوی یاخی ئەبن ئەوسا بەهەزاران لیرەمان ئەفەوتیٔ. بەلام ئێستە کەوا جەنابتان ئەختیٔ تەنگتان پیٔ هەڵچنیو یەك دوو جار هێناتانو بردتان ئاغا تازەکەی ناچارە بۆ ئەوەی ئیشو کاری خۆی پەکی نەکەویٔت ئەم قەرزەی بۆ ببژێریٔت، وە وەختی حاصلات لیٔی دابکشیٔنیٔ بەم جۆرە ئەبیٔ بڕوا ناکەم هەبیٔ توانیبێتی قەرز لەلادێیی بسێنێتەوە. چونکە هی وایان هەیە واریداتی دە ساڵی لەمەودووای لە ئێستەوە

خواردووە. لێرەدا جگەرەیەکی دا بە زابتەکەو بۆشی داگیرساند، زابتەکە بە تەماشا کردنێکی پڕ ئیحترامەوە سوپاسی کردو مژێکی‌دا لە جگەرەکەو وتی:

-بەڕاستی تووتن ئەمەتە! بەگم ئەمە ئەیکڕن؟ بیٔ گومان یەکێکی وەکو ئێوە ئەبیٔ توتنی وای دەست ناکەویٔ لەم ساڵانەدا.

م. بەگ بەفیزێکەوە وتی:

-توتنی خۆمە، کە گەڕامەوە



بەوەکیلەکەم ئەڵێم جاخێکتان بۆ بنێرێت. زابتەکە وتی:

سوپاستان ئەکەم بە زیادبیٔ- ئەختیٔ راوەستا وەکو بۆ قسە بگەڕیٔ ئینجا وتی: ئازانم بەگم ئەم قەومە بۆچی هیچ چاکەیان لەبەر چاو نی‌یە! ئەوەتە گەورەیەکی وەکو ئێوە دەستیان ئەگریٔ لە تەنگانە دەریان ئەهێنیٔ ئەیان ژێنی‌تەوە کەچی قەرزەکەی وا ئەدەنەوە.

م. بەگ یش بەگەرمی قسەکەی لەدەم قۆستەوە وتی:

-چی ئەفەرموویت! بەسەری تۆ نزیکی بیست سی هەزار لیرەم بەم دێهاتانەدا بلاوکردۆتەوە، جووتم بۆ کڕین، تووم داونیٔ، لەهەزار کەشمەکەشو دەردی سەری ئەیان پارێزم کەچی ئەبینی واپاداشی چاکەم ئەدەنەوە! ئاخر بۆیە ئەم ولاتەی ئێمە پێش ناکەویٔ.

ئەمان لەم قسانەدا بوون سۆفی هەسەن بەسەرو چاوی خوێناوی‌یەوە کردی بەژوورا چەتەوڵەکەشی بەدووەوە بوو وتی:

-بەگم رازی بوو ئێوە مانگاکەی بەرن لەباتی قەرزەکانتان.

م.بەگ هەستایە سەر پیٔو دووای ئەختیٔ کۆکە کۆکی پاڵەوانانەو بەلفەم دابەش کردن بەچوار دەوری خۆیا تەماشایەکی سۆفی کردو وتی:

-دیت چۆن هەقی من نافەوتیٔ؟ باشترین ریٔ بۆ ئێوە ئەوەیە مل بدەنە کارو کاسپی خۆتان واز لەدزیو جەردەیی‌و تەوەزەلی بهێنن!.. سۆفی هەسەن وەك ئەم قسەیە لەپڕ کەرامەتو عیزەتی نەفسی ساڵەهای سال لەژێر پێدا پلیشاوەی ژیاندبێتەوە تەماشایەکی ئاگرینی م. بەگی کردو وتی:

-بەسە! بەسە! دز ئێمە نین ئێوە دزن، ئێوە جەردەن، ئێوە بەری رەنجو تەقەلای داماوان ئەدزن ئێوە نان لەدەمی برسی ئەفڕێنن، ئێوە دووا بزگوڕی بەری ژنو منالمان ئەدزن، رووتو قووت ئەیان خەنە ئەو دەشتە بیٔ ئەوەی بەبیرتاندابیٔ شتێکتان کردووە، ئێوە هەزاران ساڵە هەر رۆژە لەژێر پەردەیەکا، هەر ساڵە بەناوێکەوە، هەردەمە بەجۆرێك ئەمان چەوسێننەوە. لەسەر ورگی ئێمەی برسی‌و رەشو رووت بۆخۆتان ئێروتەسەلو پۆشتەو پەرداخ رائەبوێرن! ئێوە جانەوەرێکی هەڵمەتەکاسەن وەك زەروو خوێنمان ئەمژن.. ئەزانی‌و هەژاری ودیلیمان ئەدۆشن! بەلیٔ هەق نافەوتیٔ بەلام ئەو هەقەی نافەوتیٔ هەقی داگیر کراوی ئێمەیە ئێمەی مزرو رەنجبەر، ئێمەی رەشو رووتو زۆر لێکراو. لێرەدا زابتەکە زللەیەکی لیٔدا وتی:

وس نارەسەنی دەوید باب قسە قۆڕانە لە کویٔ فێر بووی، ورتەت لەدەم بێتە دەریٔ سەد ئەوەندەی ترت تیٔهەڵئەدەم. بڕۆ لەگەڵ (عەلی) مانگاکەی بەریٔ بابیهێنیٔ بۆ بەگ- روویەکی کردە م. بەگ- بۆ کویٔ ئەفەرمووی بۆتی بەریٔ!

م. بەگ وتی: بیبا بۆ دیٔی (س) بە "ع" ی وەکیلم کابرای پیرەمێرد سەرێکی باداو وتی:

-چوار مێخەم بکێشنەوە سەنەدەکەم وەرنەگرمەوە مانگام ئەداوەو نایدەم. مردم ئەوەندە ئەم قەرزەم بژارد. م. بەگ سەنەدەکەی دایە دەست "عەلی" ژەندرمە کە دووای وەرگرتنی مانگاکە بیداتەوە بە مام هەسەن وە بەتەوسێکەوە وتی:

-راستە من بیٔژم دیٔ پارەی سواڵکەری وابخۆم بڕۆ ئەمجارە ئەمەت بەس بیٔ!

مام هەسەن بیٔدەنگ دووی ژەندرمەکە کەوت، وەك بەسەرهاتی ئەم دوو رۆژە گیانێکی تازەی کردبێت بەبەردا بیٔ بۆڵەو ناڵە لەگەڵ پیٔی ئەسپی ژەندرمەکە دەرچوو. کە گەیشتە ئاوایی ئەوی لەبەر دەرگا راگرتو خۆی چووە پشتێرەکەیان کە بەشی لای سەرووی ژووری نوستنیان بوو. مانگا زەردی پێش خۆیدا کە گەیشتە بەر دەرگا دەستێکی بەسەریا هێنا بە ئەسپایی ناوچەوانە سپی‌یەکەی ماچ کردو بیٔدەنگ پەتەکەی دایە دەست ژەندرمەکەو ئەویش بەستی بە قەلپووزی زینی ئەسپەکەیەوەو لیٔی‌دا رۆیشت. سۆفی هەسەنیش لەسەر سەرە بوێلکی بەرماڵەکەیان وەك بت چەقی بوو دوو دڵۆپ فرمێسك بەری تروسکایی چاوە کزەکانی گرتبوو بیری ئەکردەوە لەبەری رەنجی چەند ساڵەی، لەهاو دەمی شەوانی بێداری لەمانگا زەرد.. لەبەر خۆشیەوە ئەی وت: (هۆی هەموو ئەم ئازارو جەورە، ناتەبایی‌و بیٔ هۆشی‌و گەلۆزی خۆمانە راست ئەکا شێتە قسەکانی ئەخشی بەردن).

سلێمانی

١٩٤٤

# خـــازێ



هـەروا لەوبـەری ماڵەکەمانـەوە، بەرامبەر بەشـەقامەکە ژوورێکی روخـاو هـەبوو. وادیـار بـوو پاشماوەی خانوویەکی گەورەبوو کە بـەرجادە کـەوتووە خـاوەنی پـێ‌ی نـەکراوە دروسـتی‌کاتەوە. رۆژ نەبوو یەکدوو رێبوار لەبەر خۆیانـەوە، یـا بەیـەکتر نـەڵێن: "ئـەوە بۆچـی بەلەدی‌یـە ئـەو کەلاوەیە تەخت ناکـات دیمـەنی شەقامەکەی ناشیرین کردووە؟

بەیانی‌یـەک لـەماڵێ هاتمـەدەرێ دیـم کرێکـاری بەسـەرەوەیە خـەریکن تێکـی ئـەدەن لـەدڵی خۆما گەلێکم پێ خۆش بوو کە ئەم کەلاوەیە لەبـەر ماڵەکـەمانا نـەما کـە ئـەت وت دەموچـاوی زەلامێکە پارچـە بۆمبا نیـوەی بردبێ.

یـەکدوو رۆژ دوای ئەمـە، نیوەڕۆیـە دیـم هـەروا لـەجێ‌ی ژووره تەختکراوەکە لێفولکەیـەکی شـڕ گرمۆڵـە کراوە چڵـک‌و کۆنـی وایـان لێ کردبـوو نـەمزانی رەنگـی چی‌بووە. هیچ بـەبیرما نەئەهات لـەو لێفـە شـڕە پیسـە بچمـە پێشـەوە ئەگـەر لـە نزیکیـەوە سـەتڵێکی شـکاوو گۆزەڵەیـەکی لێـو کـەل‌و جـامێکی قوپـاوی ژەنگـاویم نەدی‌بایـەو دوو سـێ زەلامـی بـە هەڵـەداوان لێ‌ی نەچوونایـە پێشـەوەو یـەکێکیان چمکـی لێفەکـەی رانەکێشـایەو بڵـێ "خـازێ؟!" چمکـی لێفەکـە بـە دەسـتیەوە هـات بـەڵام دەنـگ نەبوو، کابرا وتی: نەمردبێ؟ بە ئەسـپایی لێفەکـەی لادا. دەموچاوی دەرکـەوت بـەڵام چە دەموچـاوێک! ناچاریشـم بڵێـم دەموچـاو چونکـە کەلەبـەرێکی تیاکرایـەوەو دەنگێکـی کپـی سـاردی سـوواوی لێ هاتـەدەرێ وتـی: توخـوا لێـم مـەدەن! لێـم مـەدەن نەخۆشـم! زیـاتر لێ‌ی چوومـە پێشـەوە. وادیـار بـوو رۆشـنایی نەئەویسـت بۆیـە دەسـتێکی وەکـو قامیشـی پـەڕۆ تێ‌پێچراوی گرت بەچاویەوە، کە لەچاو زیاتر لەدەمی دوو برینی گۆشتە زوون هێنـاوە نـەچوون. لەگـەڵ دوو کابراکـەدا بێ‌ئـەوەی چە ناسـیاوێکمان لـەمیانا بێـت، وەک دیمـەنی گرێنـەرو پـڕ لـە کوێرەوەری ئەم ژنە کردبینی بە دۆستێکی دێرین، لێیان چوومـە پێشەوەو پرسیم ئەم ژنە چی‌یە! کێ‌یە؟ کابرای پێشوویان وەرامی دامـەوە بەسەرسوڕماوی وتـی: خـازێ! چـۆن خـازێ ناناسـی؟ ئەبێ خەڵکی ئێرە نەبی؟

منیش بەرامبـەر بـەم شـالاوەی کابرا وەکو قوتابی‌یەک مامۆستا لەتاوانا گرتبێتی بە شـەرمێکەوە وتم:

-بەڵێ تازە هاتوومە ئێرە، بۆیە نازانم خـازێ کێ‌یە؟ کـابرا وەک یەکێ لەخوای ویستبێ نەزانێکی وەکـوو منـی دەسـت کـەوێ بەشـانازی‌و خۆهەڵکێشـانێکی دیارەوە ووتی:

-ئـای بـرا! ئـەم دەعبایـەی وا ئێستە پیاو بـێزی لێ نەکاتـەوەو زات ناکات هەر تەماشای بکات، بیست ساڵ لەمەوبەر شۆڕە ژنێ بـوو ناسک‌و نـازدار، دوو چاوی رەشـی گەشـی بـەباوەش پرشـنگیان لێ هەڵئـەقولا، پرشنگێکی دڵفڕێن، چاوترسێن، پیاوپسـێن . بـەقاقای پێکـەنینی، بـە لەنجـەولاری شـیرینی ئـەو تـەلارەی مـاڵی

"میران بەگ" ی کردبووە بەهەشتی شادیو سەرچاوەی جووانی، گۆرانی سەردەمی جوانو پیر باسی روومەتی ئاڵو چاوی رەشو رەوتی پوری خازێ بوو. هەرزەکاران وەکو هەنگ بەدەوری تەلارەکەدا ئەسوڕانەوە بەو هیوایەی بەتیلایی چاو لەدوورەوە تەماشایەکی بکەن. بۆیە ئەڵێم بەتیلایی چاو چونکە ئەیان بوو بوێرێ لێی نزیک ببێتەوە.

کابرا هەر ئەوەندە پشوویدا تاکو یادگاری کۆکردەوە ئینجا هەناسەیەکی هەڵکێشا وتی:

-"بەلام لێم بپرسە بڵێ خازێیەکی لادێیی هەژار چۆن گەیشتە ئەم تەلارەو چی کردی بە قیبلەگای دڵی هەرزەکاران؟"

بێئەوەی چاوەڕوانی پرسیاری من بکات خۆی وەرامی خۆی دایەوە وتی:

-خازێ کچۆڵەیە بوو چواردە ساڵە بەو جوانییەی باسم بۆ کردی، دایکو باوکی لەبەر دەست کورتی فرۆشتبوویان بە پیرەمێردیکی خەڵکی دێیەکی دراوسێیان بە (٣٠) لیرە شیربایی. خازێ ئەگەرچی ئەم شووکردنەی لا لەمردن ناخۆشتر ئەبێ وە زۆر ئەگریو ئەپاڕێتەوە بەلام دڵی ڕەقی دایکو باوکی بەزڕەی لیرەی کابرا زیاتر ئەرم ئەبێ تا دەنگی گریانی ئەم. ئەی گوێزنەوە بەلام بۆ کوێ؟ جەهەنەم! نە شەو لەجێدا حەسانەوەیەک، نە رۆژ لەماڵا حەوانەوەیەک. بۆڵەو خوتەی دشو گرمەگرمی مێردو لێدانو تێهەڵدانی پێنج هەنەزاش لەلایە، کە هەرە بچووکەکەیان چوار ساڵ لەخۆی گەورەتر ئەبێ.

دارو گۆشت ئاشنایەتیان نیە، بەناچاری هەڵدێ بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ ئەچێ. بچێتەوە ماڵی باوکی؟ هەی خوا ئەکا گوایا کێ لەدنیای رووناً بە هەرزەکاری ئاشتی؟ باوکی ئەبوو؟ بچێتە شوێنێک دەستی مێردەکەی ئەگاتێ. بەناهومێدی خۆی ئەخاتە ماڵی "بایز ئاغا" کە ئەوسا دەسەڵاتیان ئەوەندە هەبوو کەمێردەکەی خازێ هەر بەخەوی شەوانیش بە بیریا ئەیەت ژن لەوان بسێنێتەوە.

هەر کە ئاغاژن چاوی پێ ئەکەوێت ئەچێتە دڵیەوە ئەنێرێت جلی بۆ بکەنو ئەیکا بە کەنیزەکی تایبەتی خۆی. چەند مانگێ وا ئەژی. لەو دەمەدا "ن" ناو کابرایەک ئەبێ بەکاربەدەستی ئێرە. زۆر دۆستی بایز ئاغا ئەبێ. رۆژێک لای ئاغاژن کەنیزەکە جووانەکە ئەبینێو کەلێی ئەپرسێ ئەمە کێیە ئاغاژن بە بەژنو بالای خازێدا هەڵ ئەداو ئەڵێ: ژنی پیاوێکی پیرەمێردە بەدیاریەوە دانەنیشتووەو هەڵهاتووە. "ن" وا لە ئاغاژن ئەگەیەنێ کە چووەتە دڵیەوە.

کە ئەو ئەڕوا ئاغاژن خازێ بانگ ئەکاو تێی ئەگەیەنێ کەوا "ن" بەگ زۆری پەسەند کردووە ئەیەوێ بیکا بە کەیبانووی خۆی. خازێ دەست ئەکا بەگریانو شین، بەئاغاژن ئەڵێ: قوربان من پەنام هێناوەتە بەر ئێوە ئەمە ڕەوای هەق نیە ئێوەش بم خەنە پاڵ زرتەبۆزێکی بێکار. من ژنێکم مێرددارو خاوەن کەسو هەقدار."

ئاغاژن بە توڕەییەوە پێی ئەڵێ: (ن) بەگ لەوانە نیە، پیاوێکی باشە. ئەمی تەنیا بۆ خزمەتی خۆی ئەوێ. خۆشی بێو ترشی بێ ئەبێ هەر بچیت. وە ئەگەر لەوەش زیاتر لاساری بکات ئەتوانێ حەپسی بکا وە یا لەوەش خراپتری لێ بکات بینێرێتە کارخانە کچەکە ئەمە ئەبیسێ، خۆی ئەدا بەسەر دەستو پێی ئاغاژندا وەگەڵێ ماچی ئەکات وە لێی ئەپاڕێتەوە بەلام بێ سوود ئەبێ لەدواییدا بە ئاغاژن ئەڵێ: دەسا قوربان کەواتە ئیزنم بدەن بچمەوە لای مێردەکەم، خوا ماڵتان ئاواکات. ئاغاژن لەمە زۆر توڕە ئەبێ ئەڵێ باشە هەر ئێستە ئەنێرم مێردە سەگبابەکەت بهێنن لەبەرچاوی خۆت حەسیرمەیدانی کەن- چارەت نییە پیسی بەدنەمەک. ئا وەرن کوڕە ئەم بەیتەشەیە دەستوپێ ببەستن و شەوێ بیبەنە ماڵی "ن" بەگ.

لۆزەندری ئەکا بەژووراو دەست ئەداتە پەلی خازێی نیوە لەهۆش چوو ئەی باتەدەرێ.

لەماڵی "ن" بەگ تا سێ چوار رۆژ کەس خۆی تێناگەیەنێ لە پیرێ ژنێ بەولاوە، کە وەکو پەپوولە دەورو خولی ئەداو تاوێ دڵخۆشی ئەداتەوە، تاوێ ئەی ترسێنێ، دەمێ جبێ. جوانو خشڵو دیاری بۆ ئەهێنێ بەم جۆرە مانگێک ئەمێنێتەوە. بەدرێژایی رۆژ خازێ لەماڵەکەدا رایەت، لەگەڵ پیرێژن ئەبنە دۆست. خۆشی نازو نیعمەتو تێریو خانمی ئەچێژێ. شەوێک لەدەنگی پێی زەلامێک راست ئەبێتەوە، ئەڕوانێ "ن" بەگ بەزۆر بە خواهشت، بەهەڕەشەو بەتەماع، بەبزواندنو بەتەفرەدان خازێ لەو شەوەوە ئەبێتە دۆستی "ن" بەگ. ساڵو نیوێک وا مایەوە لە کڕنووش بۆ کردنی پیاوماقوڵان، لە حورمەت گرتنو ماستاو ساردکردنەوەی گەورەماڵان، لەڕووالەتو بەپیرەوە هاتنی خانمان، خازێ ئەوەندەی دیو ئەوەندەی بۆ کرا بڕوا ناکرێ فریشتەش بوایا بەبیریا بهاتایە کەوا لەسەر نوێلکی نزمیو بێ شەرمیدا ئەژی.

دوای ساڵو نیوە، رۆژێک فەرمان بۆ "ن" بەگ دێ کە بچێ بۆ شوێنێکی تر، ئەویش هەرچی جلو بەرگو خشڵ بەخازێ خۆیەوە ئەبێ ئەیداتێو هەندێکیش پارەی بۆ جێ ئەهێڵێو لێئەدا ئەڕوا.

ئەمەوا، بەلام وەنەبێ کەسوکاری خازێ بەم کردەوەیەی رازی بووبن تەنیا هەر دەست بەستراوی ئەوە بوون کە لەبەر "ن" بەگ دەستیان ئەی ئەگەیشتێ کە ئەو رۆیشت گرێی دەستیان ئەکرێتەوە، شەوێک لەناکاو دوو برای دێن هەڵی ئەگرنو ئەی بەنە ئەو کەژە، لەوێ سەری ئەخەنە سەر تاوێرێکو بەردێک ئەماڵن بەکاژەلەی سەریا دوای ئەوە دوو سێ خەنجەریشی لێ ئەدەن، لاشەکەی بەجێ دێڵن بۆ قەلوداڵ. بۆ بەیانی کابرایەکی شووان لەو نزیکانە مەڕ ئەلەوەڕێنێ چاوی بەلاشەیەک ئەکەوێ کە لێی ئەچێتە پێشێو دەست ئەدا لەدڵی تێئەگا هێشتا گیانی تیاماوە. ئەی باتە دێ لەپاش ساڵێک تیمارکردنو دەرمان کردن بۆ بێوڵەتیو لۆمەی پسان نامرێت وە لەوپەرییە ئەم دەعەجانییە ئەمێنێتەوە کە لەپاش چەند ساڵێک خەڵک توانییان بیناسنەوە ئەویش بە دەموچاوا نە، بەوەدا کە خۆی چونکە شێت بووە هەر لەبەرخۆیەوە وڕێنە ئەکا، ناوی ئەو کەسانە ئەهێنێ کە ئەوسا ناسیونی. باسی ئەو ژیانە ئەکا کە ئەوسا رای بوواردووە. لەوساوە بەرۆژ سواڵ ئەکاتو بەشەویش لەپەنا پاسارێکا سەر ئەنێتەوە. ئەمە پێنج ساڵ ئەبێ ئەم کەلاوەیەی گرتووە بەشەو لێی ئەنووێ. وا ئەویشیان روخاند، ئینجا بۆیە ئەبینی خۆیو هەرچی خوا پێیداوە لەو چەقی رێیەدا گرمۆڵە بووە. بەسەزمانە منالە وردکە زۆر ئازاری ئەدەن.

کابرا کە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بووەوە. دڵۆپێ فرمێسک لەچاویا قەتیس مابوو. ئەوی تریان رووی کـ ،ـدە من وتی: "خوا لێی خۆش بێ لەدنیای روونا سزای خۆی دیی!" لێرەدا خازێوەک دارکاری بکەن زریکانی وتی: "دەلا، دەلا، لێم مەدەن، ماڵتان کاول بێ لێم مەدەن توخوا!"

ئیتر بلاوەمان لێ کرد. هەموو بەزەییمان لێ ئەتکا، بەلام هەر بەزەیی رووت، بێ ئەوەی یەکێکمان بیریش لەڕێیەک بکاتەوە کە ئەختێ ئازاری پیریو لێ قەوماویو پەک کەوتوویی ئەو کلۆڵەی پێ کەم ببێتەوە.

هەڵەبجە

١٩٤٣

# کەرە لۆتی مەنوچەر

(١)

هاوینی (( ك. )) زۆر گەرم بوو منیش چونکە نەختێ بە خۆوەم بە گەرما گەڵێ قارس ئەبم. بۆیە دووری و ناخۆشی ڕێم خستە لاوە، هەرچۆنێ بوو، خۆم گەیاندە ماڵی (( جەوهەر )) ی ئامۆزام لە (( پ. )) کە کوێستانێکی تا بڵێیت خۆش و سازگارە.

جەوهەر، کەوا نزیکەی دووساڵ بوو چاومان بە یەك نەکەوتبوو. زۆری پێ خۆش بوو. دوای بەخێرهاتنێکی گەرم وتی:-

- وادیارە زۆر بەختت هەیە چونکە سبەینێ کەشفێکم هەیە لە دێی (( د. )) کە خۆشترین دێی ئەم ناوەیە.

ئەگەر ماندوو نیت وەرە لە گەڵمان. منیش بە دوو دڵی وتم:

- ئەگەر شەو لەوێ نەمێنیتەوە یەم. وتی:

- باشە لە بەرتۆ نامێنینەوە.

بەیانی زوو هێشتا دنیا تاریك و ئێڵ بوو کەوتینە ڕێ.

بەر لە چێشتەنگاو لە ملەیە چووین بەو دیوا تەختایی یە هاتەڕێمان، کابرای خاوەن فرمان کە لە گەڵمان بوو دەستی بۆ درێژ کرد ووتی:-

- دێیەکەمان ئانەوەتە لەو دۆڵەی پیش دەممماندا، بەلام زەویەکەی لە من داگیر کراوە ئا ئەو پەڵە چنارەیەکە دیارە لە داوێنی ئاوایی یەوە؟، ئینجا ئەوە کانی یەکی تیایە، هەر ڕاست لەو لای کانی و پەڵە چنارەکەوە زەویەکەی من دەست پێ ئەکا!

نزیکەی نیو سەعاتی پێچوو ئینجا گەیشتینە ئەو پەڵە چنارەی کابرا ڕیشی خستە سەری. دیمان کانی و ئاوێکی خۆش لەنزیکیەوەیە، دوو بەردە نوێژ لەم بەرو لەو بەری دانراوون. کابرایەکی کەڵەگەتی پیری کۆماوە لەسەر یەکێکیان دانیشتووە پشتی لە ئێمەیە دەست نوێژ ئەشوا. بەو بەریەوە خڕکەلەیەکی پتەوی دەموچاو کونج ڕیشێکی پڕ بە دەستی ماش و برنجی قەڵەمکراوی لێ بەرداوەتەوە.

سمێڵێکی فشی بە دووکەڵی قەنگەو ئاگر زەرد هەڵگەڕاو لێوی سەرووی داپۆشیوە. ڕانك و چۆغەیەکی سووری لەبەرایە بە دڵی ئەو ئاغایەی ویستوویەتی گوندۆرە لە باخەڵیا ئەوەستێ.

هەژدە هەژدە قسەی بۆ ئەکرد بەلام کە ئێمە گەیشتینە سەر کانی یەکە و سلاومان لێ کردن ئەو بێ دەنگ پشتی تێ کردین و ڕووی کردە ناو پەڵە چنارەکە و لەوێوە دوورە و پەرێز وەستا، چاوە بزەکانی وەکوو هی پشیلە لە تاریکە شەوا ئەبریسکانەوە.

جەوهەر چاوێکی بە شوێنەکەدا گێڕا وڕووی کردە من ووتی:

- ئەڵێی چی لێرە نان بخۆین؟

ووتم:- باشە

ووتی:- با جارێ بچین نیشەکەمان جێبەجێ بکەین ئنجا ئەگەڕێینەوە. بایز بانگی کردە ژەندرمەکەی:- ئەو جلانە بێنە ڕایان خەو چێشتەکەمان بۆ گەرم کەرەوە تا دێینەوە.

کابرای خاوەن فرمان وەکوو کەتنێکی گەورەی پێ کرابێ لە جەوهەر هاتە پێشەوە ووتی:-

- قوربان چۆن ئەبێ نەفەرموونە ئاوایی؟ هەمووی هەنگاوێکە، قاوەڵتی ئامادە کراوە. چا دەمکراوە لە سایەی خواو سەری ئێوەوە لە هیچمان کەم نی یە

زۆری لەم بابەتەوە ووت جەوهەر ئەی بیست، ووتی:

- باشە تۆ هەر نەختێ دۆمان بگەینەرێ ئیتر هیچمان لێت ناوێ. جارێ بڵێ بزانم، ئەوەتە زەویەکە؟

ووتی:

- بەڵێ قوربان ئەوەتە، زەویە باریکە ئاوی خۆی بە خۆیەوەیە.

جەوهەر دۆسیەی گرت بە دەستەوە و بەداواکەرەکەی ووت:

- کوا داوالێکراو ئەهاتووە، ئێوەش خەبیرتان هەڵنەبژاردووە، ناچارم خۆم هەڵی بژێرم. کوا پیر و پیاوماقووڵ و دەم ڕاستی دێ کێن؟ لاکەوون تا سێ کەسیان لێ هەڵبژێرم سنووری زەویەکەمان نیشان بدەن.

داواکەر ووتی:

- میرم ئەمانە هەمووی خەڵکی دێی ئێمەن: ئەوە سۆفی ئەوڕەحمانی مارف، ئەوە مینەی هەسەنی کاکل، ئەوە ئەلی وەیسی قارەمان، ئەوە کاکەوڵای ئەریمان هەموو پشتاو پشتیان لەم دێیەدا بڕاوەتەوە. هەموو ئەهلی سوننەت و جەماعەتن.. بە خوا بۆ باوکی من دەست ناکێشنە شیری خوا[١] کامیان ئەکەی بە ئەهلی کوێرە (خوێرە) بیکە قبوڵمە.

جەوهەرچاوێکی گێڕا بە خەڵکەکەدا کە لە دەورمان گرد بوو بوونەوە. لە پاڵ چنارەکانا کابرای خڕەی دێی لەگەڵ هاوڕێکەی ڕاوەستا بوون وادیار بوو ئەو باسەی بۆ تەواو ئەکرد کە هاتنی کتوپڕی ئێمە پێ ی بڕی بوو.

جەوهەر دەستێکی بۆ درێژ کردن ووتی:

- ئێوە هەردووکتان! ناوتان چیە، خەڵکی ئەم دێیەن، کابرای کەڵەگەتیان زووتر هاتە دەست ووتی:

- بەڵێ قوربان خەڵکی ئێرەین. ئەم مەنوچەرە، خۆشم ئەو ڕەحمانی شێرزادی خزمەتکارت! ئەمەی ووت و هاتە بەردەمی وەستا.

جەوهەر ووتی:

- باشە ئێوە هەردووکتان لەگەڵ ئەوپیرە مێردە سوور فلە بێن بە خەبیر. ناوی چیە؟

سۆفی ئەوڕەحمان ووتی:

- ناوی کاکە سوورە. من و ئەو قبووڵمانە بەلام (ئێستیکی کرد و بە کزی یەکەوە ووتی:

- ئەبێ لە مەنوچەر ببووری!

جەوهەر ووتی:

- بۆ؟ ئێمە تەنیا ئەوەمان لە ئێوە ئەوێت سنووری زەوی چی پێ ئەڵێن کەڵەکاوی؟ مان پیشان بدەن چی یەتی خۆ خزمی کەسیان نی یە؟

سۆفی ئەوڕەحمان ووتی:

---

[١] قورئان ئاخۆن

- ئەوەڵڵا قوربان ، هەر خۆی پیاوێکی سەیرە سوێندی خراپی بەدەما هاتووە.

جەوهەر:- چۆن؟

سۆفی‌ئەورەحمان:- تەڵاقی خواردووە کە لە هیچ فرمانێکی میری‌دا قسە نەکا و بۆ هیچ شتێ ڕوونەکاتە سەرا !

جەوهەر سەرێکی بادا ووتی:

- ئارەزووی خۆیەتی. جارێ بابچین بۆ فرمانەکەمان.

- خاڵۆ ناوت چی‌یە؟ ڕووی کردە یەکێ لەوانەی دەورووپشتی ئەریمانی وەیسە؟ باشە تۆ لە باتی مەنوچەر وەرە لە گەڵمان.

( ٢ )

دوای نزیکەی سێ چارەك گەڕاینەوە شوێنەکەی‌خۆمان. بەدەوری کانیەکەدا لبادو بەڕە ڕاخرابوون. هەندێکیان دۆشەك و سەرینی زل زلیشیان لەسەر دانرابوو کە تێکڕا لەماڵی هەموو پیاو ماقووڵ و خوا پێداوی دێیەکەوە هێنرابوون. بەڵام هیچیان لە بەرشڕی و چڵکنی و کۆنی ئەڕەنگ و ئەگوڵیان بەدەرەوە ئەبوو. ئەگەر ئەختێ سەرنجت بدایە کاروانی ئەسپێت ئەدی وەکوو شارە مێروولە ڕێچکەی بەستووە. بەفەرموو فەرموو پێش خۆیان داین. جەوهەریان بردە لای سەرەوە پاڵ دارتووەکە. بەزۆر دوو سەرینی ئەوەندە زلیان لەم لاو لەولای دانا هەر وون بوو لەناویاندا.منیشیان بردە تەنیشت ئەوەوە. کە چاوم گێڕا لەولاماتەوە سەماوەرێکی زەردی ژەنگاوی قوت کرابووەوە دوو سێ ڕەشو ڕووتی لنگ لە ڕانکەوە دەرپەڕیو بە دەوریا ئەهاتن. یەکێ خەڵوز و ئاگری تێ ئەکرد ، ئەویتر فووی لێ ئەکرد. لادێیی‌یەکی هەرزەکاری کەش کیتلێکی چینکۆی بە دووکەڵ ڕەش هەڵگەڕاوی بەدەستەوە بوو لەسەر کانی‌یەکە ئەی شت بەو ئاوە قولەتینەی ڕیش چەرموگ لەسەر سەرچاوەکەی دانیشتبوو دەست نوێژ بشوا. پەیتا چڵم و بەڵغەمی تێ ئەکرد.

جەوهەر ڕووی کردە خانە خوێکەمان ووتی:

(( ئێمە خواردنی خۆمان پێیە ، ئەم زەرەرە بۆ لە خۆتان ئەدەن ، وا دیارە شەکر و چاتان زۆرە ! ))

کوێخای دێ کە چرچێ بوو ڕەقەڵەی ڕەنگ زەرد وەکوو پشیلەی خەوتوو لەبەردەمی جەوهەردا دانیشتبوو هەڵی دایە ووتی:

(( میرم لە سایەی خواو سەری ئێوەوە لە هیچمان کەم نی‌یە. ))

پرمەی پێکەنینێکی پچڕێنراو لە پشتەوە هات لە کاتێکی ئەوەندە بێدەنگی‌دا کە هەموو بەیەکجار ئاوڕمان دایەوە. ڕوانیمان مەنوچەر پشتی تێ کردووین تونـ چەپۆڵە زبرە تووکنەکانی گرتووە بە دەمیەوە.

جەوهەر کە ئەمەی‌دیی ووتی:

(( ئاە ، باش بوو وەختەبوو مەنوچەرم لە بیر بچێتەوە. ئاوەرە بزانم بۆچی سوێندت خواردووە؟ بەچی پێ ئەکەنیت؟ )) مەنوچەر وەکوو هەر گوێشی لێ ئەبووبێ جووڵەی ئەکرد. تا کوێخا تێی خوڕی:

(( کوڕە مەنوچەر ! بەگ لەگەڵ تۆیەتی ! )) ڕووشی کردە جەوهەر ووتی: (( میرم لێی مەگرە ئەختێ‌شێتۆکەیە! ))

مەنوچەر بە ناڕەزای‌یەکەوە هەستایە سەرپێو بێ ئەوەی لە جێی خۆی بجوڵێت یا تەماشای جەوهەر بکات ووتی:

(( فەرموو چیتان لێم ئەوێت؟ ))

جەوهەر پرسی: (( بۆچی پێ‌ئەکەنیت؟ ))

مەنوچەر زۆر لەسەرخۆ چاوە بزەکانی هەڵبڕی وە بە کەمتەرخەمی‌یەکی منالانەوە ووتی: (( بە ئارەزوو ! ))

لام وایە ئەم کەمتەرخەمی و ساردی‌یەی مەنوچەر فیزی جەوهەری زەدە دارکرد چونکە ئەو ڕووە خۆشەی ئەماوە بە دەنگێکی نزمی لەسەرخۆ بەڵام لەرزۆك ، ووتی:

(( گەوجە ! ئەمەوێ بزانم بەچی پی‌کەنیت . پێم بڵێ ئەگینا خراپت چاو پێ ئەکەوێ. ))

مەنوچەر کە هەموو بەتەما بوون و بەچاوو دەست و دەمیش لەگەڵی خەریك بوون. کەبەسەر دەستو پێی جەوهەردا بکەوێ و لێی بپاڕێتەوە کە لێی زویر ئەبێ زۆر بە ساردی و لەسەرخۆ ووتی:

(( وەنەبێ کەزانیت بەچی پێ‌ئەکەنم خراپم چاو پێ ئەکەوێ. ))

جەوهەر ووتی: (( هەرچی چۆنێ بێت ، ئەمەوێ بزانم قسە بکە .))

مەنوچەر ووتی (( زۆر حەز ئەکەیت بزانیت؟ دەسا لە پێشا بەم کۆمەڵە درۆزنە ناپاکە و ئنجا بە تۆ پێ‌ئەکەنیم!))

لە قسەکان زیاتر جۆری ووتنیان جڵەوی ژیری‌یان لە دەست جەوهەر بەردا ئەڕانی بەسەریا (( سەگباب چۆن؟ بەمن پێ ئەکەنی ، باشە فێری پێکەنینت ئەکەم. هەبتە کوێخا پەلی ئەم ناڕەسەنە ببەستە ))

کوێخای بەسەزمانی لە ترسانا و لە شپرزەیی‌دا قسەی بەدەمەوە نە ئەوەستا هەر ئەوەندە تێ ئەگەیشتم کە ئەڵێ (( قوربان ! قوربان ! ))

جەوهەر بە توڕەیی‌یەکی تەواوەوە ووتی:

(( قوربان و موربانی پێ‌ناوێ ! من ئەمرت پێ ئەکەم هەستە پەلی ببەستە. ))

کوێخا بە ناچاری و ناڕەزایی هەستا دەستی مەنوچەری بەجامانە شڕەکەی خۆی بەست. ئەویش بێ‌نقە لەبەر دەستیا وەستا بوو وەك ئەم کەین و بەینە هیچ پەیوەندی‌یەکی بەوەوە نەبێ. کوێخا ئەختێ دووری خستەوە و کوڕێکی هەرزەکاری چوارشانەی بەسەرەوە دانا و هاتەوە لای ئێمە کەوتە دڵدانەوەی جەوهەر. منیش ئەختێ بەسەریا هاتم. ئەوەندەی پێ ئەچوو ئەچارەی جەوهەر ئەو گرژی و توندی و زەردی‌یەی ما ، نە کۆمەڵەکەمان ئەو گرژی و ساردی و بێ دەنگی‌یە. بووە گەڕە لاووژێ هەر لادێیی‌یە پەلەی ئەوەی بوو بەر لەویتر سکاڵای خۆی بۆ جەوهەر بکات ، یا بەسەر هاتێکی خۆی و سووخۆری بۆ بگێڕێتەوە ئەویش بە هەموو دڵ گوێی بۆ شل کردبوون.

( ٣ )

بەم جۆرە بە قسە کردن و خواردن و چاخواردنەوە دوو سەعاتێکمان بەسەر برد. ئنجا جەوهەر ڕووی کردە من ووتی:

(( درەنگە. هەستە با ئەختێکیش بەناو باخ و باخاتی دێیەکەدا



بگەڕێن و بڕۆینەوە. ))
مەنوچەر کە بێ دەنگ لە شوێنەکەی خۆی وەستابوو هەڵی دایە ووتی: (( ئێستە ( بەگ ) من هەر ئەبەی بۆ شار؟ ))
جەوهەر بە دوو دڵیەکەوە ووتی: (( نا. ))
مەنوچەر ووتی ((دەسا میرم لەهەر چوار مەزەبی خوا بەشم برا بێت ، بم کوژیت و بم بڕیت ، هەر لە لیریەکەوە تا قرانێ تا پوولێکم لێ هەڵ ناستێ. ئیتر گەورەی خاس بە ، تووشی چەرمەسەریم مەکە و گەڕم لێ لادە ! ))
ئەم قسەیەی وا بە کوڵ و دڵ و سادە و خۆش کرد هەمووماںی هێنایە پێکەنین وە بەتایبەتی کارێکی سەیری کردە سەر جەوهەر زانی کە لەو دیو لاساریی و قسە ڕەقیی مەنوچەرەوە دڵێکی پاکی ئازار دراو گیانێکی بەرزی ڕەنجێنراو هەیە. بەڵام زوڵم و زۆر لە گیان جاڕسیان کردووە. بە زەردەخەنەیەکەوە کە زۆرتر لە داوای لێ خۆش بوون کردن ئەچوو ووتی:
(( کەواتە نات بەم لەگەڵ خۆم. کە هیچت لێ هەڵنەستێ چیت لێ بکەم خۆ هەڵت ناپەڕێنم خاڵۆمەنوچەر ! نە تۆ مەیموونی و نە من لۆتی. )) ڕووی کردە یاساووڵەکەش ووتی: (( ئاکوڕە باڵی بکەرەوە ! )) مەنوچەریش دوای باڵ کردنەوە بەڕوویەکی خۆشەوە لە جەوهەر هاتە پێشەوە ووتی:
(( دەسا ، بەو خوایە کەمە کە باکی لە کەس نییە ، چونکە تۆ ئەوەندە گەورەیەکی خاسی بۆتی ئەگێڕمەوە کە بۆچی پێ'کەنیم و بۆچی سوێندم خواردووە لە هیچ فرمانێکی میریدا قسە نەکەم باوانەزانی مەنوچەر کابرایەکی شێتە و ڕاو ڕەسمی گەورە و پچووکی نازانێ. جا نازانم تاقەتت هەیە گوێم لێ بگری یان نا؟ ))
جەوهەر تەماشایەکی منی کرد و ووتی: (( با بیگێڕێتەوە ناخۆش نییە تۆ خۆت لەم بەسەرهاتانە

ئەگەڕێیت. )) ڕووی کردە مەنوچەریش ووتی: (( دانیشە لەسەر ئەو دۆشەکە و دەست پێ بکە. ))
مەنوچەر لەسەر بەردێ هەڵتروشکا و نەختێ گەرووی پاك کردەوە وەك بۆ گۆرانی ووتن خۆیئامادەکات ئنجا ووتی: (( میرم ! ئێمە کەلەلاین ، ئازار دراوین ، ڕووتکراوین ، ئەم ڕەشاییەی ئەمان بینی بەبەرچاوتەوە دێین و دەچین پیاو نین ، پیاوەتی گیانمان هەر لە زووەوە تیا نەماوە ! بووکە دارینەین ، ئێستە کەوا ئەبینی بە دەمتەوە پێ'ئەکەنین وامەزانە لە خۆشیانایە. واتێ مەگە بەدەم لە کانگای دڵەوە پێ'ئەکەنین ! گیانمان لە ژێر جەور و زەلالەت و جەخاردا تاساوە ، لە مێژە پێکەنینی ڕاستەقینەمان (( لەسایەی خواو سەری ئێوەوە هەموو شتێکمان هەیە. )) لەبیر ئەماوە. ئێستە تەنیا لە ترسانا پێ'ئەکەنین ، یا ڕاستتر ، دیت کە هەموو سەری ڕەزامەندییان بۆ لەقاند بۆ ئەو کەللە شەکرەی شکاندی. تەنیا من پێ'ئەکەنیم ، ئەویش لەداخانا یا چونکە ئەمتوانی تا دەستم هەڵئەگرێ بدەم بەناو دەمیا بۆ ئەو فیشاڵەی بەناوی ئەم ڕەشو ڕووت و زۆر لێکراو و بەش خوراوانەوە ، لە ڕێی خوادا ، کردی. ناچار دامە پێکەنین ، پێ'کەنینێکی پڕ تەوس و پڕ داخ ، پڕ قین پڕ تاڵی و ئازار. وە ئەوە بوو جەنابیشت قینت لێم هەستا ! بەڵێ لە سایەی خوا وشان و بازووی خۆمانەوە زۆرمان بۆ دێتە بەرهەم بەڵام لەسایەی ئێوەوە لێم ببورە تۆ خۆت نالێم لە سایەی زۆر دارەوە هەمووی لەناو ئەچێ. هەموویمان لە دەست ئەکەنەوە بێ'ئەوەی بەشی ژیانێکی کولە مەرگی بۆ خۆمان و ماڵ و منالمان بهێڵینەوە. ئێمە ئەم کۆمەڵەی وا ئەمان بینی خەڵکی ئەم دێیە و هی هەزاران دێهاتی تری ئەم خاکەی لە

گۆرانیدا پێی ئەڵێن ( بەهەشتی ڕووی سەر زەمین. ) هەموو لە جەهەننەما ئەژین هەموو خۆمان ، منالمان شەو و ڕۆژ ، زستان و هاوین ، پایز و بەهار ڕەنج ئەدەین و ئەچەوسێینەوە بێ'ئەوەی تێر سکی خۆمان نان بخۆین. نانی گەنم نا چونکە هەر بۆ ئەوە کراوە ئێمە بی چێنین و ئێوە بیخۆن. بەڵام بێ ئەوەی تێر نانی جۆ، نانی کاڵ، نانی ئاردە برنج بخۆین. بێ'ئەوەی بتوانین بۆ خۆمان نا ، چونکە خۆمان ئەبێ باخەڵمان گوندۆرەی تیا نەوەستێ ، بۆ عەورەتی ژن و کچانمان پارچە پەڕۆیەك بکڕین کە لەشیان لە چاوی پیس و ئارەزووی شەیتانانەی زۆردار بشارینەوە ! بێ ئەوەی شوێنێکی لەم کونە سەگەی ئێستە چاترمان پێ بنیات بنرێت کە تیایا بحەوێینەوە و ستار بدەین. بۆ ئەوەی بمێنین ، نەك بۆ خۆمان بۆ خزمەتکاری ئێوە. ئەبینم سەر بانەدەیت؟ چاو لە هاوڕێ'کەت دائەگریت؟ ئەڵێیت ئاخۆ ئەم قسانەکێ فێری کردووە؟ کێ هانیان ئەدات؟ بێگومان ئەڵێیت ئەمانە قسەی خۆی نین! بەڵێ بەراستی باشی بۆ چوویت ئەم قسانە و گەلێکی تر فێر کراووم بەڵام ئەزانی کێ فێری کردووم؟ نەء ، باوەڕ ناکەم بیدۆزیتەوە خۆت خەریك مەکە بەلایا ناچێت ، من لەژێر دەستی گەلێ مامۆستای گەورەدا دەرسم خوێندووە. مەنوچەر بە کەم مەزانە من قوتابی دەرد و ئازار و مەینەتیم ، پەروەردەی زۆرداری و چەوساندنەوە و بەندینخانەم ڕۆژگار دەرسی داداووم و زۆرداری بە کردەوەی ناشرینی بێ ئەندازەی هانی داووم !
پێی ناوێ زۆر لەسەر ئەم قسانە بڕۆم گوێ بگرە یەکێ لە بەسەرهاتی ژیانمت بۆ بگێڕمەوە: پار پایزێ شەو گوێ درێژێکیان لێ دزیم بەیانی هەستام بۆ شوێن دۆزی ئەم لا گەڕام ، ئەو لا گەڕام گوێ'درێژ

نەبوو. هەر بە دێ یەکەی خۆمان و دەوروپشتییەوە نەوەستام دێ'بەدێ گەرمیان و کوێستان گەڕام بۆ ( کەرە لۆتی ). کەرە لۆتی ئەرز هەڵی لووشی ، ئاسمان هەڵی کێشا. ماندوو مردوو ڕەج بابردوو گەڕامەوە کاوول بووەکەم. تا من گەڕامەوە خواش تاقە کوڕەکەمی بردبۆوە بۆ خۆی لە دێیەکەمان و چەند دێیەکی ئەم ناوەدا دەردێ داکەوتبوو یەکەم دەستە گوڵی جوانەمەرگەکەی من بوو، لەملاو لەولاش درووێنەیەکی چاکی کرد. بێ'ئەوەی کەس لێیان پرسیتەوە یا خۆیخەریك کات بزانێ ئاخۆ بەچی مردن. ئەم کۆستە نوێیە کەرەلۆتی لەبیر بردمەوە. کە خەڵك و خوا ئەهاتن بە پرسەمەوە و ئەیان ووت (( مەنوچەر خۆت خۆش بی ! خوا خراپتر نەدا )) ئەمەندەیان لەگەڵ ووتم جارویار بیرم ئەکردەوە بە خۆمم ئەووت (( بۆچی خۆم خۆش بم بۆ؟ بۆ دەرد و مەینەتی و ڕووتی و برسێتی و چەوسانەوە؟ )) (( خوا خراپتر نەدا )) بەکفری نالێم خوایە لێم نەگری.
. بەڵام هەرچەندە لێکم ئەدایەوە بە بیری کۆڵی خۆم ئەم ئەزانی لەم حاڵە ئێمەی تیاین خراپتر ئەبێ چی بێ؟ سەرتان نەیەشێنم بەنیادەم و زەین کوێری وورده وورده برینەکانم ساڕێژ بوو ئەمانەم هەموو لەبیر چووەوە برسێتی زیفی لێسەندم. قەرزار تەنگی پێ هەڵچنیم ناچار ملم دایەوە وورده کشتوکاڵەکەی خۆم.

( ٤ )

لەمساڵ بە هارێکی درەنگ لە (هـ.) ئەهاتمەوە. هەروا لەولای ماڵەکانی ئاوایی ( ح.. ) ەوە لەناکاو بوو ئەگبەتی لووتم بوو بە لووتی کەرەلۆتییەوە. کابرایەکی یەکە لەچاوی لەچەتەووڵ'سوار بوو پێی لەئەرز ئەخشا منیش هەر بێ ئیختیار دەستم برد بۆ ملی گوێ درێژەکەم خەریك بووم

ئەملاونەولای ماچ کەم ، کابرا پاڵێکی پێوەنام بە پشتا کەوتم. کە هەستامەوە لێمان بوو بە مشتو مڕ من ئەڵێم کەرەلۆتی خۆمە و بەسەرم گرتۆتەوە )) ئەو ئەڵێ (( خانەزای خۆمە )) لەمن زۆر لەو کەم ئەختێکمان سەرو گوێلاکی یەکتری کوتایەوە ( قەرەووڵی ژەندرمە ) هات بەسەرا هەردووکمانی بە کەرە لوتی‌یەوە بەکیش کرد بۆ ( هـ. ) لەوێ خستیانینە بەندیخانەوە ، دوو شەو و دوو ڕۆژ لێمانیان نەپرسیەوە. لە هاوڕێ بەندی‌یەکانمان پرسی تێگەیشتین هی وایان هەبوو نزیکەی شەش مانگ بوو لەوێدا کەوتبوو ، ئەسپێ دابوویە کالانەی چاوی ، هەر ناوی بە بیری کەسیشدا نە ئەهات کە ئەمەم زانی هاوارمکرد ووتم: ((هەی هەژەکە بەسەرم کەرەلۆتی بوو بە خوێنم ! )) ئەمە من ناخۆ قوڕبەسەرەکەی تر چی ووتبێ.

بەیانی ڕۆژی سێیەم ژەندرمەیەک هات لە شیشی ژووری بەندیخانەکەوە ئەڕانی: ((مەنوچەر ! سەی‌ڕەشید ! )) هەردووکمان وەکوو کێچ ڕاپەڕین و چووینە بەر دەرگا تەلبەندەکە ڕاوەستاین. بەڕاستی بیرم چووبووەوە کە من کەرم لای کابرای تەنیشتمەوە بەسەر گرتۆتەوە و لەبریتی ئەوەی هەستی دوژمنایەتی بکەم بەرامبەری ئەویشم بەڵێ قەوماوێکی وەکوو خۆم ئەهاتە پێش چاو وەک بەندیخانە و هاودەردی هیچی لە دڵدا نەهێشتبێتم.

ژەندرمە کە خەریکی قفڵی دەرگاکە بوو بیکاتەوە و لەبەر بۆ دڕنی ئێمەو بۆگەنی بەندیخانەکەش ڕووی وەرگێڕابوو چاوی لە کونەکەی نەبوو تا کردیەوە ئێمە وەختەبوو گیانمان دەرچێت.

پێش خۆی داین بردینیە بەردەمی ژووریێ ڕای گرتین دووای نزیکەی سەعاتێ ڕاوەستان منیان بانگ کردە ژوورەوە. کوڕێکی لووسکەلەی باریکەلەی سمێڵ قیتی سوور و سپی سەرقژن بەرگی زاپتی ژەندرمەیی لەبەرا. بە ژوورەکەدا ئەهات و ئەچوو. بەرلەوەی ماوەم ببێ باش لەدەورووپشتی خۆم ووردببمەوە ووتی:

(( تۆی مەنوچەر؟ هەی سەگباب ! چاوچاو ڕاستو چەپ بەرماڵێکیشی لە خۆیەوە پێچاوە ! خەیاڵت خاوە من تەفرە ئادەی. هەر بە چاو من پیاو ئەناسم. پێم بڵێ کێت لەگەڵ بوو کە ویستتان ئەم ڕێبوارە ڕووت کەنەوە؟ کو اتفەنگەکەی؟ پێم بڵێ زوو زوو سەرم مەیەشێنە قسەی قوڕی پێناوێ. شایەت وەک نێرەکەر ئەزەڕێ زوو پێ لە گوناهی خۆت بنێ. )) کە ئەم بە پیرەوە هاتنەی بەگم دیی تف لە دەمما ووشک برو ، هەروا سەرم ئەسوڕایەوە وەک هۆشم بەلای خۆمەوە نەمابێت. نە ئەهاتەوە بیرم کە بۆچی لەم شوێنەم. چیم کردووە و چیم نەکردووە؟ من لەو بیرانەدا بووم کە ئەڕانیەوە بە سەرما توند بەرۆکی گرتم و ڕای وەشانم ووتی:

(( باوک سەگەی سمێڵ قشە قسە بکە ! بڵێ ئەم کابرایەت بۆ ڕووت کردۆتەوە؟ کوا تفەنگ و خەنجەرەکەت لە کوێ قایمت کردووە؟ دەستە دزەکانت کێ و کێن ! ))

کە ئەمەم بیست تێگەیشتم مەسەلەکە ئەخەوە و ئەخەیاڵ هەر ڕاستو ڕەوان ئەو خوانەناسە لە خوتوخۆڕایی و بە ناهەقی نا گوناه خەریکە ئەم کا بەدزو جەردە و فڕێم ئەداتە کونی بەندیخانەوە. وەک پیاو خۆی لەدەست مۆتەکەی خەوێکی ناخۆش ڕاپسکێنێ خۆم ڕاپسکان ووتم:

(( درۆیە دز نیم ، من گوێدرێژەکەی خۆمم بەسەر کرتۆتەوە. ئەمەوێتەوە و لەسەر هەقی خۆشم ئەم گرن خوا هەڵناگرێ ! )) نازانم من ئاگام لەخۆم نەبوو بوو دەنگم هەڵبڕی بوو یا هەر بەگ ئەی ئەویست دەنگی مسکێن ببیسێ و گوێی پێ ڕانەهاتبوو ووتی:

(( مە ئەڕێنە سەگباب ! وەرە پەنجە بنێ بەم کاغەزەدا. ئیقادەکەتە ! ))

ووتم: (( ئیفادەی چی کێ نووسیویەتی ئەوپەنجە مۆری کات. بمکوژی دەستی پێوە نانێم. )) کە ئەمەم ووت لەسەر کورسی‌یەکەی ، کە تازە لەسەری دانیشتبووەوە ئەی نووسی ، هەستاو ڕووی کردە قوژبنێکی ژوورەکە کە چاووم لەگەڵ گێڕا دیم کۆمەڵێ دار باسقەنەی ئەستوور و باریک و کورت و درێژ هەڵپەسێراون. تێگەییم لە نیازەکەی تەماشایەکی جلە شڕەکانی خۆمم کرد. زانیم کەدار و گۆشت ئاشنایی‌یان نی‌یە. ئەختێ کشامەوە دوواوە. دارێکی ئەستووری کوڵی هەڵگرت و بە تەوسێکەوە ووتی:

(( ها؟ ڕانەکەیت ! ژەندرمە ژەندرمە )) کابرایەکی تێکسمراو کردی بە ژوورا. بەگ پێی ووت: (( ئا بۆم بگرە ! )) وەک هەلوک هەڵی کوتایە سەرم ئەگەر چی من هیچ دەستم نەهێنایە بەری. بەگیش بەدارەکەوە لێم هاتە پێش. کە لام وابوو بەر هەر کوێیەکی لەشم بکەوێ ئەی شکێنێ. بە هەموو هێزی خۆی دای لە قوڵم ، بەڵام هیچ ئەوەندەی بە بیرما ئەهات ئێشی نەبوو ، وا بزانم لەبەر ئەوەبوو کە لە کاتێکدا ئەو ئەیدا لە شانو مل و دەستو پلم من دارکاری‌یەکی پێشترم کەوتەوە بیر. هی زەمانێکی زۆر لەوە پێش ، هی دەوری هەرزەکاریم ، کە لەبەرئەوەی ڕۆژێ لە هەرەوزی ئاغا دوواکەوتبووم تووشی بوو بووم هەر دارەی بەر شوێن دارێکی کۆنی تر ئەکەوت. هەر لێدانەی جۆرە یادگارێکی ئەهێنامەوە بیر. هەروا وەک خەو ژیانی میانی ئەو دوو دارکاری‌یەی خۆمم هاتەوە پێش چاو. چل ساڵ ، چل ساڵی ڕەبەق بەینیان بوو بەڵام سفت تەنرابوو بەهەناسە ساردی و کوێرەوەری دەرد و نازارو برسێتی و ئەخۆشی ،نازانم چەندی لێدام بەڵام لە پڕ وەکو شێت دارەکەی فڕێداو ئەڕانی بەسەر ژەندرمەکەدا ووتی:

(( دەستم شل بوو ! ئەم سەگبابە بەرەوە بەندیخانە لەشی خۆشە بووە بە خۆی نازانێت. ))

کابرای ژەندرمە پێش خۆی‌دام منیش لەبەر خۆمەوە ئەم ووت: (( بەڵێ بەڵێ لەشم خۆشە بووە بەخۆم نازانم ! )) کە گەیشتمە بەر دەرگاکە وەکوو شتێ غیرەتم جووڵایەوە ، لام وایە زۆری لەبەر ئەوەبوو کە شوێن دارەکان هاتبوونە ئێش ، ئاوڕێکم دایەوە لە بەگ ووتم:

(( خوا هەڵناگرێ ئەم دارکاری‌یە بۆ؟ بۆم بخوێنەوە بزانم چی نووسراوە ، ئەگەر زانیم قسەی خۆمە پەنجە مۆری ئەکەم ئەگینا منی ئەخوێندەوار چوزانم ماری تیا نووسیاوە دووپشکی تیا نووسیاوە چی؟ ))

شیڕانی ووتی: (( ئا بی گێرەوە ! بزانم ئەو دەوید باوکە ئەوقاتی لە کێوە فێر بووە؟ ئێستە تۆ من ئیتهام ئەکەی بەتەزویر؟ زۆر باشە ئەمەش گوناهێکی کە. ))

کە زانیم هەتا بێ ئۆباڵی زیاترم ئەخاتە ئەستۆ بام دایەوە پاڕانەوە قەڵفانی هەژارو بێ دەسەڵات ، ووتم:

(( میرم ! من بە باوکیشمەوە ڕایەم ناکەوێ تۆ زویر بکەم. )) زەردەخەنەیە گرتی تێگەیشتم خۆ گێل کردنەکەم کاری خۆی کرد. سەرێکی باداو بە ژەندرمەکەی ووت:

(( وادیارە زۆر گەوجە بیبەرەوە بەندیخانە هۆشی ئەهێنێتەوە کەللەی. ))

( ٥ )

ژەندرمەکە پێش خۆی‌دام بمباتەوە بۆ بەندیخانە. خواو ڕاستان لە ڕێگای بەر تەویلەکانەوە بردمی لە ڕێ سەرەڕای شانوملی شکاووم لە بەرەڵلاکردن زیاتر تاسەی ئەفەسی جگەرەم ئەکرد بۆیە بە ئەسپایی پێم ووت:

(( کـاکی خـۆم بیکـە لـە ڕێی خـوادا مـردم بـۆ مـژێ جگـەرە. بێدەنگ جگەرەیەکی بۆ دەرهێنام لە قوتووە وەرشاوەکەی. دووای ئەوەی بە ئاگری هێنەکەی خۆی دای گیرسـاند. دایـە دەسـتم و کێشامیە پەنایەکەوە ووتی:

(( ڕاوەستە. لەوێدا بی‌کێشـە با کەس نەت بینێ ! ))

منیش مژێکی توندم لێدا نەختێ هاتـەوە سـەر خـۆم پشـت ئەسـتوور بـەم پیاوەتی‌یـەی ژەندرمەکـە پێـم نـا بـە جـەرگی خۆما ووتم:

(( کاکـەی ژەندرمـە ! زۆر بـێ تاوانم بۆ خوا چارەیەکم بکە. ))

لێم هاتـە پێشـەوە و چپانی بـە گوێما: (( پارەت هەیە؟ ))

ووتم: (( لـێرە هیـچ شـك نابـەم بەڵام لە مـاڵێ یەك دوو لیرەیـەکم قایم کردووە بۆ ڕۆژی ڕەش ! ))

ووتـی: (( ئـاخر شـەڕ ڕۆژ لەمـە ڕەشتر نابێ. بەڵام لـەماڵ بە تـۆ چـی؟ لـێرە کـەس نـا ناسـێت قەرزێ ، قۆڵەیەکی لێ بکەیت؟ ))

ووتم: (( نـە بـەخوا. هـەرچی ئەناسم لە خۆم لاتترە. ( مەردان ئاغا ) نەبێ ئەویش بە خۆڕایـی پارە ناداتە باوکی! بەڵام تۆ پێـم بێـژە مـن ، کـەوا بـە شـایەت و ئیسـپات کـەر کـەری خۆمـە و بەسـەرم کرتۆتـەوە ئیتر نـازانم پـارەی چی‌یـان لێـم ئـەوێ؟ ))

ژەندرمەکـە وەك لـە کورتـی بی‌بڕێتەوە ووتی: (( وا دیارە لە گـوێی گـادا نوسـتوویت. شـت هەیە بێ پارە بکرێت. ئەی دەیت باشـە. ئـای دەیـت وادیـارە بەندیخانەکـەت بـەدڵا چـووە فـەرموو بـا بڕۆیـن. ))

ناچار و مل کـەچ ووتم ((باشـە ئەی دەم ڕەزام بە ڕەزای خوا. ))

ووتـی: (( دە بگـەڕێرەوە بابچەمـەوە لای بـەگ بەشـکو ئیقناعی بکەم لێت خۆش بێ. ))

چووینـەوە بـەر دەرگاکـە. ژەندرمەکە منی لای یەکێکی کە جێ‌هێشـت و خـۆی چـووە ژوورەوە. ئـەوەندەی پـێ نـەچوو هاتەوە دەرێ ووتی:

(( با بڕۆین. بە هەزار حاڵ ڕازیم کردووە بە دوو لیرە و نیو بەرت بـدا نیویـش بـۆ خـۆم. خـۆت ئەزانی مەسرەف گرانە. دەی بـا بڕۆیـن زوو سـێ لـیرە بهێنـە و بڕۆرە ماڵی خۆت. ))

منیش هەروا واقم ووڕما ووتم: (( هەی هاوار لیرە شك نابەم. لیرەم نی‌یە ))

زۆر بەسـەرخۆ ووتـی: (( دەسـا فـەرموو پێشـم کـەوە بـۆ بەندیخانـە. )) کـەوای ووت ئەسـپێ شـاخدارەکانی بەندیخانەم هاتـەوە بیر ، لەگـەڵ تەنگەبەری‌یەکـەی کـە بەوئەندازەیەیە زۆرمان تا بەیانی لەبەر بێ‌جێ‌یی بە کنەوە یـا بە پێـوە ڕائەوەسـتاین خـەو ئەنەچووە چاومان.

ووتم: (( نە نە ناچمەوە ! ئەمرم. ڕۆژێکی کەی تیا بم ئەخنکێم با بڕۆینـەوە شـار. سووواڵ ئەکـەم. خۆم ئەفرۆشم و ناگەڕێمەوە تـۆ بڵێیـت ڕەحمـی موسـوڵمانیەتی هەڵگیرابێت کەس بەزەیی پیامـا نەیەتـەوە و دەستم نـەگرێت؟ ))

بردمیـە بـازار. دووکـان نـەبوو سەری پیا نەکەم. ئاسیاو نەبوو دەستەوداوێنی نەبم ، بێهوودە. کەس دۆستی هەژار نی‌یە. کەس دەستی هـەژار نـاگرێت. ناچـار دەستم کرد بە پشتێنی مـەردان ئاغا دا کە خاوەنی دێیەکەمانە.

لە دووای گـەڵێ گیروگرفت سـێ لـیرەی دامـێ هـەر لـێرەی بەباتمانی ئەبوو دەستەو داوێنی ئەبم بێهوودەکەس دۆستی هەژار نۆ لیرەو بۆ (۹) لیرە سەنەدێکی لێ سەندم وە پەنجە مـۆری پـێ کـردم کـە وەختـی حـاصلات بیدەمەوە.

گەڕاینـەوە سـەرا. لـەوێ ژەندرمەکە بردمیە بەردەم بـەگ. نەختێ چرپانی بە گوێیا ڕەنگی ڕوون بووەوە ووتی:

(( ئـا..! وا دیـارە ئـاقڵ بوویـت. ئافەرم. منیـش وا ئـەم ئیفادەیـە ئـەدڕێنم وای ووت و پارچـە کاغەزێکی لەبەردەما بوو دڕانـی ووتـی (( دە بڵـێ بـزانم شـکاتت چی‌یە؟ ))

منیش بەرەو دووا باسی دزین و دۆزینـەوەی کـەرەلۆتیم بـۆ گێڕایـەوە ، وەکـو ئێسـتە بـۆ ئیوەی ئەگێڕمەوە ، ئەویش هەر ئەینووسـی. لـە دووایییـدا چـی نووسـی‌بوو بـۆی خوێندمـەوە و پەنجە مۆرمی پێوە نا. ووتی:

(( ئەوی پێتـە بیدەرە دەستم. ))

منیـش دوو لـیرە و نیوەکـەم بێدەنگ کردە دەستیەوە. ووتی:

(( باشـە بـڕۆرەوە دێ ، شایەتەکانت بهێنە ئەوسا کـەرە لۆتیت ئەدەینەوە دەست. خوات لەگـەڵ )) هاتمـە دەری لەبـەر دەرگـا نیـو لیرەکـەی تریشـم دا بەژەندرمەکە.

( ٦ )

کە ڕزگارم بوو گەڵێ جار لە ڕێو لـە دێـش ئـەهات بەسـەرماکە شـایەت ومایـەت ئەبـەم کـن بدەمـەوە سـەر دەرپـێی خـۆم. بەڵام تەماع وازی لێ ئەهێنام ووتم دووای ئـەم هـەموو چەرمەسـەری‌یەی دیومـە ئـەو پارەیـەی لە کیسم چووە هیـچ نەبێ کەرەکەم دەست کەوێتـەوە کەلەبەرێکم بۆ ئـەگرێ. یەکدوو ڕۆژ لە دێدا بـە خەڵکەوە گەڕام یـەکێ ، لەبـەر فرمـانی خـۆی ، پـێی ئـەکرا لـە تـەکما بێت. تـا بـەڵێنم دا بـەو هەمـە هەسـەن و سۆفی ئەورەحمانی شێرزادە کە ئەیان بینی ، مەسرەفی هاتووچۆ و خـەرجی‌یان بدەمـێ چـەند ڕۆژیـش لـەوێ گیریـان خـوارد ئەوەندە ڕۆژیش ئیشیان بۆ بکەم ئنجا لەگەڵم هاتن.

چووینـە ( هـ ) بـەیانی زوو لەبـەردەرگای ژوورەکـەی بـەگدا بـۆی هەڵتروشـکاین لـە قوژبنێکەوە. سێ کوچکە بـەدەم چاوەنواڕی‌یـەوە کەوتینـە ڕازو خواس. ئەوەندەی ئەخایاند بەگ بـە کەشـو فشـێکەوە دەرکـەوت ژەندرمەیـە بـە دووەوە خرنگوهـوورِی قایشوقرووشەکەشـی وەك پێشەنگ هاڕەی ئەهات. بەرزەپێ ڕاسـت بووینـەوە لەگـەڵ ئـەو هـەموو جـەماوەرەی لەبـەر دەرگاکـەی گلـیر بووبوونـەوە. هەرچەندە بـەچاو بە بزەی لێو وویسـتم تێ‌گـەینم کـە مـن مەنوچەرم. مەنوچەری ئاسیاوی بـەڵام نـەك هـەر تەماشـای چرچاوی کەسی نەکرد تەنانەت سڵاوێکیشی لێ نـەکردین. تـەنیا بـە توورەیی‌یەکـەوە بـانگی ژەندرمـە یاسـاووڵەکەی بەردەرگاکەی کرد ووتی: (( ئەم گـەرە لاوژەیـە چی‌یـە؟ حـەمامی ژنانمان هەیە ! یاڵلا دەی دەریان بکـەرە دەرێ ! نامـەوێ گوێم لـە چپـەی یـەکێك بێـت. )) کـابرای ژەندرمەش ئەی کـردە نامـەردی بە کوڵەدارەکەی دەستی بەربووە سـەرو گوێلاکمـان نـەختێ بـۆی کوتاینـەوە. خـوا هەقـە قاچوقولیشمانی بێ‌بەش نەکرد بە شەق ئەویشی بۆ ئەرم کردین ئێمـەش هـەروەکوو ڕانەمـەڕ و گورگ پەلاماری دا بێ حەپەساو چاوەڕوانی چارەنووسی خۆمـان ئەکرد.

بەڵام کابرای ژەندرمە دڕتر بـوو لەوەی بەمـە لێمـان بوەستێ بە پاڵە پەستۆ و شەق‌و دار کردین بە دەرێ وەك گوێرەکە لە پەموو دەرکـات. دووای ئـەم کـەین و بەینە بە تۆزێ. بە دزیەوە خۆمان کێشایەوە بەردەرگای بەگ. هەر وەکوو ئەبامان دیی‌بێ نە باران. ئەڵێم بە دزیـەوە هاتینـەوە ، بە دزی بەگـەوە چونکـە کـابرای ژەندرمـە تـا یـەکی قرانێکـی لێ ئەسێنین ئەی هێشت بچینەوە.

ئـەوەندەی پێنـەچوو بـەگ هاتـە دەرەوە. منیش پشت ئەستوور بە ئاسیاوی تازەمـان سنگم لێ بردە پێشەوە ووتم:

(( بەگم شـایەتەکانم هێنـاوە ! ))

بەگ بە هەردوو دەستی تا هێزی تیا بوو ، پاڵێکی پێوەنام کەوتم بەسەر هەمە هەسەنا کە بە پێوە ڕاوەسـتا بـوو ئـەوەندەی کەوتنەکـەم لـە ناکـاو بـوو هەمـە هەسـەن خـۆی پـێ نەگیرایـەوە کـەوت بەسـەر بێوەژنێکـی کوتـو کوێـرا ژنـە زریکـانی و هـاواری کرد (( هـەی هـاوار ! ئـای سکم ! ئای پلیشامەوە مردم ! خوام کرد بە گژتانا کوژرام ! دەرم بینن ! ))

بـەگ هـەروەکوو دیمـەنێکی پێکـەنیناوی دیـی بـێ بـە زەردەخەنەیەکەوە ووتی: (( کەرە نـابینی ئیشـم هەیـە؟ )) لـەم

ڕۆژەوە بۆ ئەو ڕۆژ ، ئیمرۆ بە سبەی سێ ڕۆژ هێشتیانینەوە. ئنجا نامەوێ بە باسی چونی رابواردنی سێ لادێیی ڕەشوو ڕوتی بێ خانە خوێ سێ شەو لە شوێنێکی وەك ( هـ ) دا سەرتان بیەشێنم.

بۆ ڕۆژی سێیەم کە بە ناهومێدی لەسەرا هاتینە دەرێ کە درۆی نەبێ مام هەسەن پێی ووتم (( بۆ ناچیتە خزمەت ( جەوهەر بەگ )) بەشکوو ئەو ڕزگارمان کات. یەژن پیاوی خاسە. منیش ووتم وا ئیمرۆ هیچ سۆزی لووتێن لەویش نەدەین.

بەیانی زوو خۆمان گەیاندە سەرا کە ڕوانیمان قەرەلەبالغیەکی زۆر ، ژن و پیاو و منالْ ، وەستاوون. دەرم پێدان و ملم نا بێمە ژوورێ لە پشتەوە کابرای دەرگاوان تونگ ملوانی چۆغە شرەکەمی گرت و ڕای کێشام و چەپۆکێکی مالی بەسەرما ووتی:

(( ئاخر کەرێ؟ کوێرێت؟ نابینی بەگ میوانی هەیە؟ )) ناچار منیش ڕاوەستام لەناو خەلکەکەدا . تا درەنگ هەر پیاوی عەبابەشان و نۆکەر لە شوێن ئەچونە ژوورەوە و ئەهاتنە دەرێ. ئیمەش ئەو عالەمە ڕەشوڕووتە ناوێرن هەنگاوێ لە دەرگاکە دوور بکەونەوە ئەوەکا هەلیان لە دەست چێت. ئەو ژن و منالەکەی ئەگری بۆ نان. ئەو موسولمان نوێژەکەی ئەچێ. ئەوکرێکار ئارامی نیە چونکە زوو نەچێتەوە خاوەن فرمان ڕۆژانەکەی لێ ئەبڕێت. هەی هەی کێ لە کێ ئەپرسێ و کێ ئاگای لە حالی کێیە؟ نیوەڕۆیەکی درەنگ کابرای دەرگاوان کەوتە خەلك بانگ کردن. منیش لە هەلێکدا کە ئازانم کابرات بە چە فرمانێك ناردبوو خۆشت و ژن و پیاوێکت لەبەردەما وەستا بوون هەردووکیان پێکەوە قسەیان ئەکرد ، خۆم گەیاندە بەردەستت و پەلاماری کەوشەکانم دایت ماچی کەم. وەك کێچ بەرزبوویتەوە ئەبڕانت ! ( بڕۆ کەری کەرباب نازانی وەختی موحاکەمەیە؟ وەرن دەریکەنە دەرەوە ! ) دەرگاوانەکەت و

ژەندرمەیەك وەك مووییان هەلکڕووزێنی گەیشتە سەرم. بە پالە پەستۆ کردمیانە دەرەوە منیش هەر هاوارم ئەکرد: (( هەی داد ! هەی لەڕێی خوادا بۆ کوێ بچم لە دەست ئەم جەورە؟ ))

رووم کردە هەمە هەسەن کە هۆی ئەم کارەساتەی دووایی بوو ووتم: (( گەوجی بێ عەقڵ ئەمەبوو چاکەکەیان. کوڕە چاکی چی. گشتی‌لە تووی کالەك ! بڕۆن با بڕۆینەوە خزمەت بەگی خۆمان. هەر ئەو لە خەلکی چاترە.))

نزیکەی نیو لیرەی ترمان چوو ئنجا توانیم خۆم بگەیەنمە بەگ و شایەتی شایەتەکانمی پێ وەرگرم. دووای ئەمە ووتی: (( با شایەتەکانت بڕۆنەوە تۆ بمێنەرەوە ، ئەنووسین بۆ جەهەر بەگ تا ئەو نەلێ ئیمە ناتوانین گوێ درێژەکەت بدەینەوە. تۆش خۆت سبەینێ سەر بدەرەوە. ))

بەیانی کە چوومەوە لەبەردەرگاکە وەستام تا خۆی هاتە دەرێ. کە چاوی پێم کەوت کردمیە ژوورەوە و دەرگاکەی داخست. پێی ووتم:

(( وا ئیشەکەت دیسان ئەگەرەیەکی کەی تێکەوتووە جەوهەر بەگ کەوتووە بە قیندا دوولیرەم لەوەی خۆم داوەتێ داوای یەکێکی تر ئەکا ئەگەر نەی دەیتێ ریسەکەت ئەبێتەوە بە خوری و خۆشت ئەگیرێیتەوە. ئیتر بزانە مشورێکی بۆ بخۆ. )) من زۆرم ووت ئەو کەمی بیست. هەر چۆنێ‌بوو سێ‌چارەکە لیرەی لێ سەندم ئنجا ژەندرمەیەکی لەتەکا ناردم لە خان کەرە لۆتی وەرگرمەوە. بەلام کاشکی ملم بشکایە نەچوومایە. کەرە لۆتی ئەزانی تەشریفی لە کوێ بوو بوو؟ یەژن لە شاران مسافر خانە و خانی خۆش خۆش هەیە پیاوی گەورەی تێ ئەچن شەوی بە مستێ پارەیە ))

جەوهەریش بە زەردەخەنەیەکی تفتەوە ووتی: (( ئوتێل بلێ ، ها ئوتێل لە شارەزوور گرانە شەوی بە نیو لیرەیە )) مەنوچەر ووتی (( ئا ڕەحمەت لە باوکت دەسا بە خوا وادیار بوو کەرەلۆتی لە

شوێنی گەلێ لەوەش گەورەتروخۆشتر بووە چونکە عەبەڕەشی خانچی پێی نایە ریسی ملم ئەی ووت خۆشت بێو ترشت بێ سێ لیرە هەقی خان و ئالیکی گوێ درێژەکەت لێ ئەسێنم. هەی داد هەی لە ڕێی خوادا گوێ درێژی بەلا لێ دریاو خۆی سێ لیرە ناکات ، چۆن سێ لیرە بدەم بە کرێ خان و ئالیکی پێنج شەش شەوی !؟ لێم ڕاپەڕی ووتی:

(( پێنج شەش شەو !؟ ئەمە ١٥ ڕۆژی ڕەبەقە کەرەلۆتی ها لای من. ئنجا من سەری خۆم بۆ لەگەلْ تۆ ئەیەشێنم من بەگ ئەناسم چیمە بە سەر تۆوە. ئەوی کەری ناردۆتەلام ئەچم پارەی خۆم لەو ئەسێنم. ))

ئەوەندەی پێ نەچوو گەڕایەوە ژەندرمەیە بە شوێنەوە ووتی (( فەرموو با بڕۆینە سەرا ! )) بە پاڕانەوە و لالانەوە و ئەملاو ئەولا. هەر چۆنێ بوو قەبلانمان لیرەیەکی بدەمێ و نیولیرەش دووای مانگێکی تر.

ئنجا بە ناخێرم کەرەلۆتیم دایە پێش خۆم و لۆش لۆش گەڕامەوە دێ. بە دەستمەوە بوو تا پێرێ دوو ژەندرمە لە ناکاو کردیان بە ئاواییدا و ڕاپێچیان کردم بۆ (( هـ.. )) هەرچەندم کرد و کۆشا تا چەند قڕوشێکیان لێ ئەسەندم ئەیان هێشت سواری گوێ‌درێژەکەی خۆم ببم. هەر گەیشتینە شار منیان خستە بەندیخانە کوێتەوە کەرە لۆتی‌شیان پێش خۆیان دا.

بۆ بەیانی بردمیانە بەردەمی بەگی لە مەڕ خۆم. کە ڕوانیم وا کابرای دزەی یەکەلەچاویش ( سەید ڕەشید ) راوەستاوە. (( بەگ )) بە مۆنی‌یەکەوە رووی تێ کردم ووتی:

(( کابرا ! تۆ ئەبێ گوێ‌درێژەکە بدەیتەوە بە سەید ڕەشیدی خاوەنی زووی چونکە شایەتی هێناوە کەوا ئەم گوێ‌درێژە خانەزای خۆیەتی. ئنجا تۆش ئەگەر ئەتەوێ بچۆ لە مەحکەمە شکاتی لێ بکە ! )) کە ئەمەم بیست حەپەسام دووای ئەختێ ووتم:

چۆن ئەم هەموو ڕەنج و پارەیەم هەروا بە قیڕۆ بڕوا و گوێ‌درێژەکەشم لەکیس بچێ؟ دەك خوا ، هەلی ئەگری ! شکات بکەم !؟ تازە دووای سالێ هاتوچۆ و چەرمەسەری و پارە سەرف کردن بچم شکات بکەم ، ئەی بە ناخێری گیانم تا ئێستە چیم کردووە ! نەء نەء میرم بە سەری تۆ هیچم بە دەستەوە نەما. کەوتمە سوالْ. )) وام ووت وە هاتمە دەرێ دووای ئەوەی سێ بەردەی نایە دەستم کە هەتا ماووم ئاوی نەبەم. ئنجا ماندوو مردوو بە ئاوات نەگەیشتوو سەر گەردان و مالْ وێران رووم کردەوە ئاوایی وە لەسەر دەستی مەلا عەول سەمەددا ٣ بە ٣ تەلاقم خوارد کە تاماووم بۆ هیچ فرمانێك بە ئارەزووی خۆم روونەکەمە قاپی میری توخوا سا ئاهەقمە؟! ))

جەوهەر کە بە درێژایی بەسەرهاتەکەی مەنوچەر چاوی بڕی‌بووە ئەرزەکەو نقەی لە خۆی بڕی بوو بە ئەسپایی بە دەنگێکی داخاوی ووتی:

- هەقتە ، زۆر زۆریش هەقتە ، بەلام تکات لێ ئەکەم خالۆ مەنوچەر لێم ببورە چونکە ، بێ ئەوەی بزانم یابمەوێت تووشی گەلێ دەردی سەری وە زەرەرم کردووی ئێستەش ئەمەوێ هەقت بسێنم لەوانەی ئەم زۆرەیان لێ کردوویت هیوام هەیە یارمەتیم بدەیت.

- مەنوچەر هەناسەیەکی هەلکێشا ووتی:

- میرم گەورەترین چاکەو پیاوەتی کە بتەوێ لەتەك ئەم بچووکی خۆتەدا بیکەیت ئەوەیە لێی گەڕێ یت و لەسەری نەڕۆیت. ))

جەوهەر ووتی:

- نەء، ناتوانم واز لەم کافرانە بێنم کەوا تۆیان رووتاندۆتەوە. بەگی ئاشنات ئەناسم کێیە. زۆر باشی ئەناسم.))

مەنوچەر ئەختێ وێستا ئنجا بە پاڕانەوە ووتی:

- میرم هەرچی‌یەك ئەکەی منی بەرەو ڕوو مەکەرەوە.

جەوهەر ووتی:

- نابێ ئەبێ تۆش لەوێ بیت ، هەر ئێستە بۆ ئەوەی

سوێندەکەت نەکەوێ بە زۆر لەگەڵ خۆما نەت بەم.
رووی کردە من ووتی:

- وا ڕۆژیش دەرەنگ بوو ناتوانین نەختێ دیمەنی خۆشی دێیەکە ببینین.

منیش ووتم:

- ئەوەندە باسی کوێرەوەری دانیشتوانی ئەم دیمەنە خۆشانەم بیست لەبەرچاووم کەوتن هەستە با بڕۆین.

( ٧ )

جەوهەر لە ڕێ هیچ قسەی نەکرد داستانی مەنوچەر زۆر کاری تێ کرد بوو. وای ئەزانی یەکەم جارە زۆری وا لە هەژار نەکرێت! کە گەیشتینەوە ( هـ.. ) جەوهەر بەزۆر چەند قڕوشێکی بڕی بەسەر مەنوچەرا بۆ خەرجی ئەو شەوەی، لە پاشا بە منی ووت:

- ئەوە لەوساوە بیر ئەکەمەوە ئێستە هاتەوە بیرم. پێرێ یا بەسر پێرێ یەکێ لەو کاغەزانەی تەماشام کردن لە بابەت گوێدرێژێکەوە بوو کە بدرێتەوە بە خاوەنەکەی. خەڵکی جێیەکی سەیر بوو. ( پیریایی ) ناو بوو.

منیش ووتم:

- کوا دێی وا لەم ناوە نی‌یە بەڵام لە گەرمیان ناوێکی وام بیستووە ، وا بزانم لە دەوری چەمچەماڵە بە پەرۆشەوە ووتی:

- ئوە. زۆر چاك بوو ئەم قسەیەت کرد. کەوابێ با بنێرین خانەکان بگەڕێن بەشکو ئەڕۆیشتبێتەوە بێگومان ئەویش وا بە ئاسانی گوێدرێژی مست ئەکەوتۆتەوە.

ناردی هەموو خانەکانیان پشکنی. کابرای یەکە لەچاوی لە مەڕ مەنوچەریان هێنا. ئەو شەوە بەرەڵای کرد دووای ئەوەی پیاوێکی ناسراو دەستەبەر بوو کە بەیانی بیهێنێ بۆ سەرا.

بەیانی منیش لەگەڵ جەوهەر چووم بۆ سەرا بۆ ئەوەی ئەنجامی کارەساتی کەرەلۆتی مەنوچەر بزانم. جەوهەر هەر گورج هەردوو کابرای بانگ کرد، کە سەید ڕەشیدی دواند ئەویش بەسەرهاتێکی بۆ گێڕاینەوە لە هینەکەی.

مەنوچەر پڕ چەرمەسەری و کوێرەوەری تر. لە دووای هەموو شتێك ووتی:

- بڕوا بکە میرم من ئەوەندە بە تەنگ خۆمەوە نیم ، بەڵام ئەورەحیم ، ئەورەحیمی بەسەزمان پیرەمێردێکی شەست ، هەفتاساڵە بەزۆر لە گەرمیانەوە لەگەڵ شایەتەکانم بەکێشم کردبوو بۆ شایەتی. لە دارای دنیادا نیو لیرەی شك ئەبرد ، ئەویش من دابووم پێی بۆ خەرجی ڕێو کرێ ووڵاخ. بەگ ئەویشی لێ سەند سێ بەردی نایە مشتی کە هەر ئەو ساتە لە ( هـ ) دا بەنگ ئەبێ بڕواتەوە. ئەویش ناچار ملی ڕێی گرت. ئنجا خوا ئەزانێ بە لاتی و برسێتی لەو ڕێیە ، ئێستە گورگ خواردوویەتی ، گرە لێی داوە ، ڕێی هەڵە کردووە چی!

جەوهەر ئەوانی کردە دەرەوە و ناردی ( ئەژاد)ی زابتی ژەندرمەی بانگ کرد کە لاوێکە بە قسە بۆ نیشتمان سووتاو. کە هات ترس و پەشۆکاوی لێ ئەباری سڵاوێکی عەسکەرانەی بۆ جەوهەر کرد و ووتی:

- فەرمووو میرم خێرە؟ وا بەم بەیانی زووە ناردووتانە بە دووما؟ هەر خۆم بە دەستمەوە بوو بێمە خزمەتتان بەڵام هەندێ کاری پەلەی ڕەشو ڕووت و هەژارانم لابوو کەوا لە دوێنێوە ماونەوە حەزم ئەکرد ئیشەکانیان تەواو کەم و ئەوسا بێمە لاتان بەشکو ڕزگاریان ببێت بچنەوە سەر کار و کاسبی خۆیان. بەڵام (کاکی ) هەر بە ڕاستی لێم بوو بە مباشر ماوەی ئەدام ووتی جەوهەر بەگ بە پەلە ئەیەوێت ! جەوهەر بە تەوسێکەوە پێی وت کە سوپاسی ئەکات ئەوەندەبە پەرۆشە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری فەقیر و هەژار بەڵام وادیارە فەقیر و هەژار خۆیان سپڵەن ئەوەتە لە هەموو لایەکەوە لێی کەوتوونەتە شکات و پرتە و بۆڵە. ئنجا لەسەر خۆ هەموو خراپی‌یەکانی خۆی پێ ووت لە پێشەوە هیچ ئەچووە ژێری وە هەر باسی پاکی خۆی بۆ ئەکرد و کردەوە باشەکانی خۆی ئەهێنایەوە بیری بەڵام جەوهەر ماوەی ئەدا زمانە لووسەکەی بخاتەکار هەرزوو ڕێی لێ بەستەوە بە هەڕەشەو بە قسەی خۆش ه؛:ایە بەر بار پێی لە هەندێکی ت‌ا کە بەردەستەکانی کردوویانە و لە پاشا بەویان ووتووە.

جەوهەر پێی ووت:

- قسەو باس و سوێند و قورئانی پێناوێ مەسەلەی کەرەلۆتی وەکوو خۆی ئەزەڕی وەکوو ژماردوومە ئەوەی لە مەنۆچەر سەید ڕەشیدی بەد بەخت سەنراوە ، جگە لە خەرجی خۆیان و شایەتیان بیستویەك لیرەیە کە گوێدرێژەکەش خۆتان نرختان بە شەش لیرە بڕیوە هەر ئێستە ئەچی ئەم پارەیە ئەهێنیتەوە وە دووای ئەوەش لێت ئەنووسم کە جەزایەکی تەواویش بدرێت خۆ ئەگەر توانیت بە بەرتیل چاری خۆت بکەیت ئەوا هەر لە ئێستەوە دڵنیابە کە تا من لەم شوێنە بم نایەڵم پارچەیەك کاغەز بە ئیمزای تۆوە بێتە سەرمێزەکەم ئیتر ئۆ باڵی خۆت بە ئەستۆی خۆت. ))

( ئەژاد ) لێدا چووە دەرەوە مشووری پارەکە بخوا ، بە قسەی خۆی ، جەوهەریش مەنوچەر و سەید ڕەشیدی بانگ کردەوە ژووری و پێی ووتن کە هەر ئێستە ئەژاد بیستویەك لیرەیان بۆ ئەهێنێت هەر کەسەیان بە پێی زەرەروو زیانی بەشی خۆی لێ هەڵگرێت بەڵام گوێدرێژەکە هەر لای سەید ڕەشید ئەمێنێتەوە چونکە ئیسپاتی کردووە کە خانەزای خۆیەتی.

مەنوچەر هەناسەیەکی هەڵکێشاو نەختێ لە مێزەکەی جەوهەر هاتە پێشەوە ووتی:

- بەگم خوا بەر قەرارت کا لێم ناگرێت قسەیەك هەیە لە خزمەتدا بیکەم.

جەوهەریش بە سەرسامی‌یەوە سەرێکی هەڵبڕی ووتی:

- فەرموو برا چی ئەڵێیت بڵێ.

مەنوچەر نەختێ گەرووی پاك کردەوە لە بەینی شەرم کردن و ئەوێرانا بەدەنگێکی کزی لەسەرخۆ ووتی:

- بم وەساقەت ڕەنگە وا بزانیت خاسی‌یە فرە خاست لەتەکا کردووین؟ بەم فرمانە دوایی‌نەت؟ نە بە گیان باوکت نەت پێکیاوە هەر بە جارێك ماڵت وێران کردین قوڕت پێوەدا

جەوهەر بەو پەڕی حەپەساوی‌یەوە پرسی:

- بۆ خاڵۆ مەنوچەر؟ بۆچی؟ ناتەوێ پارەکەت بدرێتەوە؟

مەنوچەر زۆر لەسەرخۆ ووتی:

- بەڵێ میرم ئەمەوێ بەڵام بەمە کردتین بە دوژمنی توخمی ژەندرمە ئیتر ، من بەش بەحاڵی خۆم ، مەگەر بارکەم لەم ووڵاتە ئەگیناهەر ئەم بێژن.

ئەمەی ووت و لێی‌دا چووە دەرەوە بەدووی سەید ڕەشیدا کە وا دیار بوو بە دووری جێگای و دەسکەوتنەوەی گوێدرێژەکەی لە مەنوچەر زیاتر دڵخۆش بوو.

منیش کە. تا ئەو دەمە بێ دەنگ دانیشتبووم رووم کردە جەوهەر ووتم:

- گوێت لێبوو لالۆی پیرە چی‌ووت. ئەوە هەر ئەو قسانەیە کە من بە جۆرێکی تر پێم ئەوتیت ئەم چەشنە ئیشە یەکتەنی‌یانە ئەوەندە بایەخیان نی‌یە ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە ، خانو لە بنەڕەتەوە وێرانە تەقەلای هەرەوەزی ڕێکوپێك و بێووچان و بازووی بە هێز و ژیرانی دڵسۆزی ئەوێت بۆ لە سەرچاوەوە ڕوون کردنەوە و لە بنەڕەتەوە بنیات نانەوەی.

سلێمانی
١٩٤٥

## ژانی گەل

لەڕو لاواز و شڕۆڵە ، لە بەشی پێشەوەی پاسێکا ، لە نێوان لێخوڕ و ژەندرمەیەکی لۆزەندەرا دانیشێنرا بوو ، دەستی ڕاستی لەگەڵ دەستی چەپی ژەندرمەکە کەلەپچە کرابوو ، ئۆتمۆبێلەکەشیان هەڵتەک هەڵتەک ڕێگەی پڕ لە هەوراز و نشێوی شاری ( چ ) ی گرتبووە بەر، ئەویش بیری ئەسرەوتی وەکوو وێڵ ئەسووڕایەوە ، بێ ئەوەی بەشتێکەوە بگیرسێتەوە یان یەکێک لەو دیمەنانەی وەکوو سینەما بەسەر پەردەی مێشك و بە بەردەمیا تێ ئەپەڕین سەرنجێکی ڕاکێشن ، گێرمە و کێشەی دیار و نادیاری دوا ڕۆژ و ڕووداوی ناخۆش و پڕ بیرەوەریی ئازاراویی ڕابوردوو لەسەریا وەك پوورە هەنگ وروورژابوون ، کاس و وڕیان کردبوو ، نە ئەیزانی چارەیە بۆ ئەویان بدۆزێتەوە ، نە ئەشی توانی خۆی لەدەس ئەمیان ڕزگار بکات .

تا بە ڕێکەوت لەهەڵتەکاندنێکی توندی ئۆتمۆبێلەکەدا ، لە ئاوێنەی بەردەمی لێخوڕەکەدا ، چارەیەکی بەدی کرد، گورج دوو چاوی کاڵی مەنگ سەرنجیان قۆستەوە کەلە هەموو ئەندامێکی کەی ، کەمتر ساڵانی زیندان کاریان تێ کردبوو ، ئەو چاوانەی سەدان جار لە ئاوێنەی ڕیش تاشینەکەیا دیونی نە هیچ هەستێکی تایبەتییان تیابزواندوە و نە ئەمیش بایەخێکی تایبەتیی داونێ . بەڵام ئەم جارە گەیشتە فریای لە گرنگترین شتا کە لەو کاتەدا پێویستی پێی هەبوو ، کە ئەویش خۆ دۆزینەوە بوو . بەڵام لێرەشا بیری ئاوارەی هیچ ماوەی لێکۆڵینەوەیەکی ڕێکو پێکی نەدا ، هەر وەکوو چاوەکانی ناونیشانە بووبن ڕێگەیەکی هەڵە کردووی پێ دۆزیبێتەوە، وەك مەلێکی زامدار لەپڕ کۆنە هێلانەیەکی بێتەوە بیر ، بەری هەموو ئەو خۆ دۆزینەوەیەی بەوە دەرچوو کە بە پەلە پڕووزێ خۆی بگەیەنێتەوە تەلاری بلووڕینی یادگار ، یادگاری پێش گیران و زیندانی ، بەڵام لەوێشا ئەوەندە

## دڕك و گوڵ

بەشی یەکەم

(١)

- ماڵ ئاوا ، دانیشن بە خێر ، پشت بە خوا و پێغەمبەر دوو ڕۆژی تیا ئامێنێتەوە بەر ئەبێ . کوێراییم دایە بۆ ئەم جوانانە .
- دەك خوا هەڵی نەگرێ ئەم زوڵم و زۆرە ...
- خواتان لەگەڵ . دڵتان هیچ نەکات . (( هەر مەرگیان نەبینین ...)) گرتن چییە ، هەر گوێشی مەدەنێ ... قەی چێ کا خۆ ئەو لەو هەموو خەڵکە زیاتر نییە .
- دوژمنتان کوێر بێ . خواتان لەگەڵ . (( زۆر بەخێرهاتن . دەستی دایکت ماچ ئەکەم . خواتان لەگەڵ و...)).

بەم جۆرە گفتوگۆیە گوڵناز بەشی تا نیوەڕۆی ئەو ژنانەی بەڕێ کرد کە بە دەنگ گرتنی (( نەریمان )) ی کوڕیەوە هاتبوون . (( خورشە )) ی کارەکەر هەر گەیاندنیە ئەو دیو دەرگا گورج خڕ دای خستەوە ، وەك ترسی ئەوەی هەبێ کە لەپڕ دەستەیەکی تر بکەن بە ماڵا !

بەدەم ڕۆیینەوە یەکێك لە ژنەکان بەوانی کەی ووت : خۆزگەم بەو دڵ و دەروونە فراوانەی ، کچێ خۆ ئەڵێی مێشیشی میوان نەبووە ! بەوخوایە من سەعاتێ حەمەم بگیرێ ، شێت و هار ئەبم . یەکێکی کەیان ووتی : ئاخر بۆیە حاڵت باشە ، نابینی ئەڵێی پیرێژنی سەد ساڵەی ، ئەویش دوژمن بە سی ساڵە دانانێ ... سی ساڵی چی ؟ ئامە خوای لێ بێت ڕوومەتی ئێستەش سەری لەبەر دابێنە ، هەر مێردە داوێن پیسەکەی لووتی لێی خوارە ئەگینا ... نا ، سەهوی گیانە ، گوڵناز گوێی ناداتێ ، وەکو شتێ بەرەڵڵای کردووە .

- کچەکە ئەوە بۆ وایان لێهات ، خۆ لای خۆیان حەزیان لەیەك کردبوو گوڵناز وازی لە ﴿ موعەلیمەیی ﴾ هێنا لەبەر ئەو .
- جەنابی ئەوەندە دڵپیس بوو ئەی ووت پێم ناخۆشە پیاوە کاربەدەستەکانی دایرەی مەعاریف هاتوچۆی مەکتەبەکەی بکەن !
- ئیتر بڵێین چی دنیاکەی وایە ! خۆ خوا هەر چی شت هەیە نای دا بە یەکێك . هەر کەسە دەبێ لە شتێکی کەم بێت ، هەر خۆی تەواوە بە قوربانی بم ! خوایە بە گوناە لێم نەگری ، ئەرێ پوورە فاتۆڵ پێم ناڵێی ئەوانەی وەکو ئێمەومانانن خوا چی داونەتێ ؟
- نە کچم ! ناشوکر مەبە بە بەشی خوا ، شەش منداڵت هەیە ئەڵێی پەڕەی گوڵن ، هی واش هەیە هەناسە بۆ بێچوە پشیلەیەك هەڵئەکێشێ ... بەس نیە هەموو بە چاوو گوێن و ئومەتی موحەمەدن ، ئەگەر کلك و شاخیان بوایە چیت ئەکرد؟ ژنەکەش سەرێکی بۆ ئاسمان هەڵبڕی و ووتی :
- خوایە لێم نەگری تۆیە شوکرم بە بەشت .

کوڕێکی بچکۆلەی کە لەلایەوە ئەڕۆیشت هەڵیدایەو ووتی :

- ئینجا ئەوسا ئەیان خستینە سینەماوە ،ئەوە ئەبوو ئەوجارە لە



بەخۆشی ڕای ئەبوارد ، چونکە شوێنێکی تایبەتی و کاتێکی دیار وەك کارەبا دڵیان بە کێش ئەکرد کە ئەوانەش هەمان شوێن و کاتی گۆڕین بوون کە بە درێژایی ژیانی بەندیخانەی تەقەلای لەبیر خۆ بردنەوەیانی ئەدا .

هەرچەندە نزیکەی دە ساڵ لەوە پێش بوو بوو ، لەگەڵ ئەوەشا زۆر بە ڕوونی و دیاری ئەهاتنە پێش چاوی مێشکی . نەك هەر وەکوو بەسەرهاتێ دوێنێ ڕووی دابێت ، نە بگرە وەکوو قەومارێك کە لەو کاتەدا لەبەرچاوی بقەومێ :

دەمە دەمی ئێوارە بوو . با لە ئاسمانی ئاڵۆز و لێڵی پایزا پەڵە هەورە پرش و بڵاوەکانی داگرتبوو ، خەریکی گلێر کردنەوەیان بوو. لەسەر ئەرزیش گەڵای زەردی لەمان بێزاری گەڵا ڕێزانی لە دار و درەخت ئەکردەوە و بە گڤە گڤێکی پڕ تووڕە و تڕۆیی و فیزەوە ڕاپێچی ئەکردن و پێش خۆی ئەدان . ئاو بە ئاویش بێ دەنگی یەکی پەژاراوی وەك لە گڤە گڤ بێزار بوو بێت، ئەیدا لە لووتی پیرە باو کپ و دەمکوتی ئەکرد . لە خانوویەکی خنجیلانەدا لە گەڕەکی ( س ) لە شاری ( چ ) لە ژوورێکی سادە و پاك و دڵگیرا کە دوو پەنجەرەی گەورەی بەسەر باخچەیەکی بچکۆلەی هێشتا باش ڕێك ئەخراو و بە گەڵا ڕێزانی پایز زەرد هەڵگەڕاوا ئەی ڕوانیو هەموو کەل و پەلی ژوورەکە بریتی بوو لە چارپایەکی دوو کەسی ئاسن لەگەڵ باڵا ئاوێنەیەکی پێچکەدار ، کەوا لە قوژبنێکی ژوورەکەدا دانرابوو لەگەڵ پێخەوێکیش کەوا لەسەر ئەرزەکە ڕاخرابوو ، ژنێکی منداڵ کاری خوێن شیرین کەوتبوو ، شالاوی ئازار ڕووی گەشی گرژ کردبوو ، مێردە لاوە

سینەما منداڵێکی دوو سەریان پیشان داین.

- کوڕە هەتیور ئەبی ووس بە خوا کوێرت ئەکات .
- بەو خوایە کە بەیانی بیستم ئەریمان گیراوە کسپە کەوتە جەرگم وای کە کوڕێکی باش و خزم دۆستە ، یەکێ لەو منداڵانە ئەبینێ ئەوە ئیتر هێندە ئەیان لاوێنێتەوە منداڵی تایەن لە خۆی ئەگۆڕێت .
- خوا هەقە دایکەکەشی وایە ، خوا بە دڵی خۆیان لەگەڵ بکا ...
- ئەرێ بەقوربانت بم پورە فاتوڵ تۆ بڵێی خوا ئەم زوڵمە قبوڵ کات ؟

پووره فاتوڵ سەرێکی ڕاوەشاند و ووتی :

- ئەەکچم ، کاسە کە پڕ بوو لێی ئەڕژێ ... سەگی هار چل شەوی عومرە ... ئەم قسانە بە خۆڕایی ئەکراون !
- ئۆی هانام کردە دەست ، ئاهوو نزولەی ئەم خەڵکە بیان کات بە کۆی زوخاڵ .
- باجی ئایشێ ! هەر بگرە و بیکەرە ژوورێ ، هەر بگرە و بیکەرە ژوورێ ئاخر هەتا کەی ؟ چییان کردووە ئەڵێن : نان نیە ، ئەڵێن خوێنی میللەت ئەمژن ، هاواریانە لە دەست زوڵم و زۆر ، جا ناهەقیانە ؟ ئۆ باڵ بە گەردنم کەمیشیان ووتوە فەقیر و هەژار مردن لەم گرانی و بێ ئیشی یەدا . خۆ ڕاستت ئەوێ شت ئەوەندە گران نی یە بەڵام پارە نی یە پێی بکرێت !
- زوڵمی وا لە دەوری فەیلەقوسیشدا ئەکراوە . خوا هەڵێ پێچێ ئەم دەزگا و دووکانە !
- خەمت ئەبێ ، خوا خوای سوڵتان مەحمود و دارتاشەکەیە !

خورشەی کارەکەر هەردەرگای لە دوای میوانەکانەوە داخست ، هەناسەیەکی وای هەڵکێشا وەك یەکێك بارێکی قورسی لە کۆڵ بوو بێتەوە ، بە پەلە چوو بەلای گوڵناز خانەوە و لەبەر خۆیەوە و بە دەنگێ کە ئەویش گوێی لێ بێت ووتی :

- بەوخوایە کەمە ئەم هاتوچۆکەرانە ئاوکەرێژیان کردین ... هەر بە ڕاستی بە مەرەیەکیان بردین کە دەردی خۆمانمان بیر چێتەوە ...

گوڵناز خان قسەکەی پێ بڕی ووتی :

- ئەوە بۆڵە بۆڵی چیتە کچێ ؟ گلەیی لەو کەسانە ئەکەیت کەبە تەنگ خەمی خەڵکەوە هەن و لە ناخۆشی و لێ قەومان و خوا ئەکردە کۆست کەوتندا دەچن بە دەنگ هاوار و نرکە و ناڵەی یەکتری یەوە و دڵخۆشی یان ئەدەنەوە و هەوڵ ئەدەن خەمیان بڕەوێنت ؟ جا گەوجە ئەگەر دڵ و دەروونی ئینسان ئەو هەست و هۆشی هاودەردی و هاو خەمی و بەزەیی یەی تیا نەبێ بەچی لەدار و بەرد جیا ئەکرێنەوە ؟ جگەلەوە ئەم چەشنە کۆبونەوانە لە تەنگانەدا یەکێتی مان پتەو ئەکات و زیاتر لە یەکتری نزیك ئەبینەوە کە ئەوەش بناغەی یەکگرتنی ڕاستەقینەیە ! خورشە کەوا لەم چەشنە قسانە نەئەگەیشت خەریك بوو قسەکەی پێبڕێ ئەویش لەسەرخۆ و بە زەردەخەنەیەکی دایکانەوە پێی ووت :

- گیانەکەمی با جارێ واز لەم قسانە بهێنین ، خواردنەکەمان ڕووی مەجلیسی نی یە ، زووکە بڕۆ بیهێنە با تا خەڵکی تر نەهاتوون خۆمان لەویش و لە برسێتیش ڕزگار کەین ...

ئیتر ڕووی کردە ژووری دانیشتن ، ڕوانی سەماوەرەکە ساردبۆتەوە ، مقاشەکەی ئەختێ لە دووکەڵکێشەکەیا گیراو هەڵی بڕی و یەك دوو فوی توندی پیا کردو چەند پشکۆیە ئاگری لە مەقەڵی یەکەدا تێکرد، پیرە سەماوەر کەوتە گیزە گیز ، خۆشی لەبەریا دانیشت بیری لەوە ئەکردەوە کە چۆن ئەو خەڵکە وا زوو خەبەری گرتنی ئەریمان یان زانیوە هەر ئەبێ یەکێ لە پۆلیسەکان باسی کردبێ و قسەش کەوتە زارێ کەوتە شارێ .،، لەسەر نان خواردن بە خورشەی ووت :

- ئەو ژنە دڵی خستمە مەراقەوە ، ئەی ووت شەوێ ماڵی خاڵتیان پشکنیوە ، بچۆ بە فرکانێ بزانە چیبووە ، هەمیشە ماڵی خاڵم لەو شتانەیان لە ماڵا هەیە کە پۆلیس بۆی ئەگەڕێ ، زۆریش کەمتەرخەمن ، هەزار جار پێم ووتوە ، بەو کوڕە شێتۆکەیەی ، کە ئەوەندە کن لێکەوتوو ئەبێ ، ڕۆژێ جەزرەبەی پێ ئەگەێنن ، خوا ئەزانێ چەند کەسی کەش لەگەڵ خۆی تووش ئەکات ! هەستە دەی بڕۆ : بەڵام گیانەکەمی زوو وەرەوە .
- باشە با چاکەم بخۆمەوە ئەچم

گوڵناز هەناسەیەکی هەڵکێشا و تەماشایەکی سەعاتی دیوارەکەی کردو لەبەر خۆیەوە ووتی :

باریکەلەکەشی لە ژوور سەری دانیشتبوو ، بەزەیی لە چارەی ئەباری ، زۆر بە ئەسپایی و وریاتر لەوەی دەست بەریٚ بۆ پشکۆی ئاگر دەستی بە پرچە ڕەشە خاوەکەیا ئەهێنا ، بیٚ تروکاندن چاوە کاڵە مەنگەکانی بڕی بووە برژانگە شاشە درێژە هەڵگەڕاوەکانی کەوا جار و بار هێرشی ژان ، بە گرژ کردنی ناو چەوانە ئەختیٚ بەرزەکەی ، بە ئاستەم لەسەر چاوە جوانە ڕەشەکانی لای ئەبرد ، بە دەنگێکی وەك چرپە بە ژنەکەی ووت :

(( هیچ نی‌یە گیانە ! ئەختیٚ دان بە خۆتا بگرە ، دەمێکە ئازیٚ ڕۆیشتووە ، ئەبیٚ مامانەکە بەندی کردبیٚ لای خۆی ، یان هەر لەوانەیە لە ماڵ ئەبوو بیٚ و چاوەڕێی بکا ، بیٚ گومان ئێستاکە بەڕێوەن )) ئەگەرچی ژنە هیچ نیشانەیەکی سەلماندن یا نەسەلماندن ، بگرە هی گویٚ گرتنیشی لیٚ دەرنەکەوت ، بەڵام وا دیار بوو ئەم قسانە پەرۆش و چاوەڕوانی‌ی مێردەشیان کەم نەکردەوە ، چونکە هەر گورج دوای ئەمە وتی :

- باشتر ئەوەیە خۆم بچم بە دوویانا ، ئەوەکا درەنگتریان پیٚ بچیٚ ! کە ژنە ئەم قسەیەی دوایی بیست بە دەنگێکی بەرزتر لەوەی لیٚی ڕەچاو بکرێت قیژانی وتی :

- نە گیانە ! مەکە ، بەجێم مەهێڵە ! تۆ بڕۆیت من لە ترسانا شێت ئەبم !

ئەختیٚ بیٚ دەنگ بوون . ژنە هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە زەردەخەنەیەکی بە ئازار و ژاکاوەوە ، کەوا لە چاوە ڕەشەکانیا پتر دیاری ئەدا تا لێوە وشکە شین داگەڕاوەکانی ، وتی : .

- چەندم حەز ئەکرد کوڕێکمان بوایە !

ژان قسەکەی پیٚ بڕی ، دوای هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشان ووتی :

- خوایە بە ناشکوریم لیٚ نەگری ! زۆر ناخۆشە دوای ئەم هەموو ژان و ئازارە کچم ببیٚ !

مێردە وەکوو تازە لە قسەکەی گەیشتبیٚ ، بە تووڕەیی‌یەکی کوتوپڕی ساردەوە وتی :

- کوڕ چی‌یەو کچ چی‌یە ؟ ئەم قسە زۆر لە ئەقڵ و ژیری‌ی تۆ بە دوور ئەزانم ، لام وایە ئازار سەری لیٚ شێواندووت ، ئەگینا کەی تۆ وا کۆنە پەرست بووی ؟!

ژنە دەمی کردەوە قسە بکا مێردەکەی بە ئەسپایی دەستی خستە سەر لێوە ووشکەکانی‌و ووتی:

- بەسە توخوا کاڵیٚ گیان بەم چەشنە خەیاڵانە دڵی خۆت ئازار مەدە ، بەلای منەوە هەر تۆ خۆش بیت و زوو ڕزگارت ببیٚ ئیتر کوڕو کچم لا وەکوو یەکە

ژنە سەرێکی بادا وەکوو بەقسەکەی باوەڕ ئەکا . گورج مێردە ووتی :

- بە ڕاستی زۆریان پیٚ چوو ! بە تەواوی تامی تیا ئەما . لە هەمووی باشتر ئەوەیە خۆم بچم بە شوێنیانا ، ئەوەکا تووشی شتیٚ بووبن .

- ژان و ئازار پتر شاڵاویان بۆ ژنە هێنا ، دوا تروسکەی خۆشی‌یان لە چارەیا نەهێشت ، دانی چەقانە لێوی کە ماوەی هاوار و قیژەی نەدا ، ئارەقە بەسەر چاو و لاملیا ئەهاتە خوارەوە زەنگۆڵ زەنگۆڵ ، مێردە دڵی گوشرا ، بیٚ ئارامی و شپرزەیی و دوو دڵی‌یەکی تەواو گەمارۆیان دا ، لە ژوورەکەدا دەستی کرد بە هات و چۆ بە جۆرێك کەزیاتر لە لۆقە کردن ئەچوو تاپیاسە کردن ! پەیتا پەیتاش تەماشای سەعاتەکەی مەچەکی ئەکرد ، ئەوندە شڵەژا بوو ئەی ئەزانی سەعاتەکەی لە جێگەی خۆی وەستاوە یا ڕائەکات .

ئەی ویست شتیٚ بکا ، هەر شتیٚ بیٚ ، بەهەر نرخیٚ بکەوێتە

- سەعات دوو چارەکیٚ کەمە دوێنیٚ ئەم حەلە سەعات زیاتر بوو ئەریمان هاتبووەوە لەسەر ئەو کورسیەی بەرامبەرم دانیشتبوو قسەی بۆ ئەکردین ئینجا بە دەنگی بەرز ووتی :

- بە تیرەوە بن ! ئەیان هێشت دوو شەو لەناومانا بیٚ . ( هەروەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە بە پەلە هاتە دەریٚ لە ژوورەکە و چووە سەریٚ بۆ ژووری نوستنیان ) .

خورشە لەبەر پلیکانەکانەوە بانگی کرد :

- وا من ئەڕۆم هیچ ئیشی کەت نییە ؟

- نەنە ، خوات لەگەڵ بەڵام زوو بێیتەوە ، بە تەنیام ، ئێستا کونی میوان ئەکرێتەوە ، دەرگاکە لەگەڵ دەستی خۆت توند ڕاکێشە خراپ بووە دانا خریٚ ! گوڵناز دوو پریاسکەی بچووکی بە دەستەوە بوو خستنیەوە جی‌ی خۆیان و لەسەر چارپایەك کەسیەکەی خۆی درێژ بوو :

بەس ئەبوو ئەم دوو پریاسکەیەی هەر لەبەر دەرگاوە دا بە من ، خوا ئەکەردە بەمانەوە بیانگرتایە ! چیم ئەکرد !؟ ئەریٚ ئەوە لە کوێیا شاردبوونیەوە ؟ کوا ئەوە خۆ کەس دیار ئەبوو ئەم ئامانە ببات ، بەس ئەبوو پی‌ی ووتم ئەگەر ئەو شتێکی لێهات و تا دوو ڕۆژ کەس نەهات چیان لیٚ بکەم ! وای کە ئەم باسی شت لێهاتنەی کاری کردە دڵم ، وادیار بوو ئەیزانی ئەگیریٚ ئەت ووت لە دڵمایە کە ووتی : بۆ مات ئەبی دایە بۆچی کەس بەوەسیەت مردووە ؟ بەڵام هەموو کارێك ڕیٚ و شوێنی خۆی بۆ دابنرێت باشە . قازانجی ئەبیٚ زەرەری نییە بیٚ چاوێنی بێت وەکوو پیاو قسە ئەکات

منیش ئەگەر تا سبەینیٚ کەس دیار ئەبوو بیبات ، بە ئاسکۆڵی مامەدا ئەیان نێرم بۆ ( داری واوەیلا ) ئاسکۆڵ ئەتوانیٚ لوولیان بدات و هەریەکەیان بخاتە کونە لوتێکیەوە

(( بە ڕاستی سەیرە ئەریمان گیراوە کەچی ئەم پی‌ئەکەنیٚ )) ئەبیٚ دوعا بۆ ئەم پریاسکە بچوکانە بکەم ، هەر چەندەئەکەوێتەوە بیرم کەوا ئەمانەی پیٚ نییە کە گیراوە لام وایە بردویانە بۆ سەیران ! چی لیٚ ئەکەن ؟ هیچی ئەکردووە ، چی لەو هەموو خەڵکە ئەکەن ؟ دە پانزە ڕۆژیٚ ئەیانگرن و بەناچاری بەریان ئەدەن . وای کە سەیرە خۆ ئەو خەڵکە ئەتوانیٚ حکومەتی خراپ هەر بە گاڵتە لابیات ! ئێستە پۆلیسخانە و ئیدارە چی‌یان بەسەر دیٚ کە ببینن هەر خەڵکەو ملی ڕیٚی بەندیخانە ئەگریٚ و ئەڵیٚ منیش لەگەڵ ئەوانەم کە گرتوتانن ، یان هەر ڕاست دوو ، سیٚ بروخیٚ و بڕێشی بخاتە پاڵ .

حکومەت چی ئەکات ؟! هۆ خەیاڵ پڵاو کەی تۆش کاتیٚ خەڵك ئەگاتە ئەو مەست و مۆشە ، حکومەتی خراپ لەناویانا چی ئەکات ؟ ))

﴿٢﴾

هێشتا گوڵناز چاوی ئەچوو بووە خەو سیٚ ئافرەت بەلای ماڵەکەیانا تێپەڕین پیرێژنە بەرماڵ لە کۆڵە ، تێکسمڕاوە ، گەنم ڕەنگە بەرزێك داچەکاوەکەیان بەدووانە عەبا بەسەرە بیٚ پەچەکەی هاوری‌ی ووت :

- ئا ڕاوەستن توخوا ، با بەسەر پێوە سەرێك لە گوڵناز خانە داماوەکە بدەین کوڕەکەی گیراوە خوا ئەزانیٚ ئێستا لە چ حاڵێکدایە ؟

بیٚ ئەوەی چاوەڕوانی ڕەزا بوونی هاوڕێکانی بکا دەستێکی نا بە دەرگاکەی ماڵی گوڵنازەوە کە خورشە باش لەگەڵ دەستی خۆی ڕای ئەکێشابوو کە داخریٚ ، هەر لەدالانەکەوە قیژانی :

- ئەوە لە کوی‌ی گوڵناز خانە کلۆڵەکە ؟

گوڵناز خان کە بە دەنگ قیژەکەوە هاتەدەریٚ پێویستی بەوە ئەبوو بپرسیٚ کی‌یە ، چونکە قیژەی باجی ئامینە ، یا ڕاستتر (( ئامە ڕەشەبا )) کەس ئەبوو لە سلێمانییا ئەی ئاسێتەوە گوڵناز لە دڵی خۆیا ووتی خوا چاکی کا هەر کەسیٚ وا ئەیەت تا ئەڕوات ئیتر هەرچی بڵیٚ قەی ناکا ڕەزام بە ڕەزای خوا ، با ئامە ڕەشەباش ئەختێکمان پیٚ بکات ، هەرچەند شێتۆکەیە و شێتیش قسەی لیٚ ناگیرێت لەگەڵ ئەمەشا قسەکانی لەبەر چاوی بێگانە ناخۆشن ، بەڵام ، تۆ بڵێیت دوور لە مەرگی ئەریمان لەم کۆستە کەوتنەشدا ئەو وەك جاران گەنمکردی دام گرێت !؟

- ئامە خان گیان ، ئەوە تۆی ؟ یا خوا بەخێربێیت سەرچاوی خوشکی خۆت هاتی واشمان لیٚ پرسیتەوە باشە ! ئامە (( خان )) ئاوڕێکی دایەوە سەر هاوڕێکانی کەهێشتا لەبەر دەرگا مشت و مڕیان بوو ئەیان ئەزانی دوای کەون یان بە جی‌ی بێڵن ، خواو ڕاستان بانگ کردنەکەی لە دوو دڵی ڕزگاری کردن ، سەلام و عەلەیك کردیان بە ماڵ لە کاتێکا

سەری قەی ناکا بەمەرجێ کاڵێ لەم ژان و ئازارەی ڕزگار کات بەڵام هیچی لە ووزەدا نەبوو ، هەتا ئەهات زیاتر هەستی بە هەڵەی خۆی ئەکرد ، کە چۆن ئازیزی نارد بە دووی مامانەکەدا و خۆی نەچوو بە فڕکانێ سواری عەرەبانەیەکی بکا و بیهێنێت ئێستەش نەچووە بچێ .

چۆن ئێستا بچێ ؟! ئەی کاڵێ بە دیار کێوە بەجێ بهێڵێ بە دەم ئازارەوە گەوز بدات بە تەنیا ، کەسێ نەبێ قومی ئاوی بکا بە دەمەوە ڕەنگە چی ؟ خوا نەکردە ڕەنگە بەڵێ ڕەنگە بمرێ ! هەی هاوار خوایە شتی وای لەگەڵ نەکەی وای سەری تەقی لە پڕ لە داخانا لە بێ دەسەڵاتی ی خۆی ئەڕانی :

- بە ڕاستی ئەم ژانە شتێکی بێجێ و نارەوایە ! ئۆف خوایە ئەم ئازاردانە مانایەکی تیایە ؟

ژنە ئەوەندەی لە توانایا بوو ترش و تاڵی ی چارەی پڕ ئازاری خاو کردەوەو بە دەنگێکی وەك سرپە وتی :

نە توخوا جوامێر گیان قسەی وا مەکە چۆن دڵت دێ وا ئەڵێیت گوایە بوونی ئینسانێك ئەمەندە ئازار ناهێنێ ؟! نا گیانە بەزەیی بە هەڵەت نەبات ، هاتنە دنیای ئینسانێك گەلێ لەمەش زیاتر ژان هەڵ ئەگرێ !

مێردە بە تەوسێکەوە ووتی :

- مالی بابت کلۆڵ بێ ،ئێستەش لە قسە ئەستەقەکانت ناکەوی ، باشە دەبیخۆ ، بۆ خۆت گینگڵە بدە بە دەم ژانەوە !

مێردە بێ ئارامی ی گەیشتە ئەوپەڕی ، ئیتر خۆی پێ ڕاگیر نەکرا ، بڕیاری دا کە خۆی بچێ بەدووی مامانەکەدا هەرچی ئەقەومێ بقەومێ بە دەنگێکی بەرز ووتی :

- بی گومان شتێکیان بە سەر هاتووە ! ئەگینا تا ئێستا هەر ئەهاتنەوە . ماڵەکەیان لێرەوە هەر چارەکێ بیست دەقیقە نەبێ ! خۆم ئەڕۆم هەر ئێستا بە عەرەبانە ئەیان هێنم و ئەگەڕێمەوە بە هیچ جۆرێ نیوسەعاتم پێ ناچێ سەهووم کرد ئەبوو زووتر بچم ، ئێستا لە مێژ بوو گەڕابوومەوە ( دەنگێکی نزم کردەوە وەکوو لە بەرخۆیەوە قسە بکا ) :

وای کە پیاو بە لێقەومان کزە ! ئەوە بۆچی وا سەرم لێ شێوا ؟! خۆهەر بە تەواوی کوێر و کەڕ بووم . وام ئەزانی بە تاقی تەنیا خۆم و کاڵێ هەین لە دنیادا یا لەناو دەریایەکی بێ پایاندا بە جووتە لێمان قەوماوە ، هیچ ئەو دراوسێ باشانەم بیر نەبوو ، کە بەهەر کەسێکیانم بگوتایە ئامادە بوون بە خۆیان و ژن و کچیانەوە بێن بە دیار کاڵێوە دانیشن یا بچن مامانی لە بنی دنیاوە بۆ بهێنن . ( دەنگی ئەختێ بەرز کردەوە و ووتی ) :

- هەر ئێستا ئەچم بۆ ماڵی مامە ڕەشەی دراوسێمان کچەکەیانت بۆ ئەنێرم بۆ هاودەنگی ، یا باشتر ئەوەیە دایکی بێت ، ڕەنگە دەستی مامانیشی هەبێ ، هەر چۆنێ بێ ئەو لە کچەکەی شارەزاترە لەم کارانەدا ، خۆشم ئەچم بە دووی باجی پیرۆزی مامانا ئەگەر ئەویش نەبوو یەکێکی تر ، نیو سەعاتم پێ ناچێ

ژنە ویستی قسە بکات ، بەڵام مێردە گوێ ی نەدایە ووتی :

- خوات لەگەڵ هەر ئێستە ئەگەڕێمەوە

﴿٢﴾

جوامێر بە پەلە لە ماڵ هاتە دەرێ ، خۆی کرد بەماڵی مامە ڕشەدا کە هەروا دیوارێکیان بەین بوو، نە پیاو نەکچەکەی لە ماڵ نەبوون . بە تەنیا ژنی خاوەن ماڵ لەوێ بوو ، تکای لێکرد کە بچێتە لای کاڵێ ی ژنی کەوا ژان ئەی گرێ تاکوو مامانی بۆ دێنێ چاوی لێوەی بێ، ژنە بە ڕوویەکی خۆشەوە دڵنیای کرد لە چوون و ئاگاداری ی کاڵێ کردنی :

---

کە گوڵناز خان (( ئامە ڕەشەبا )) ی ئەبردە ژووری دیوەخانەکەوە ئەویش بە بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوفەرشە ئایابەی ڕاخراوە لە ژوورەکەدا بە پێڵاوە قوڕاوییەکانیەوە وەکو گوڵی مەجلیس لنگی ڕنایە سەر لنگ و جگەرە پاکەتەکەی تووڕدا تا دەستی هەڵئەگرێت بەیەکدوو جنێوی مزرەوە بۆ داك و بابی ئەوەی جگەرەی پاکەتی هێنا بە وولاتدا ! ئینجا دەستی کرد بە گیرفانی بەر باخەڵی کەوا کۆنە سوورمە ڕەشە بەلادا کراوەکەیا ، قوتوییەکی سپی ئەوەندەی لەپە دەستێکی دەرهێنا و بەدەم جگەرە پێچانەوەوە ڕووی کردە هاوڕێکانی کە هێشتا بە پێوە وەستابوون و ووتی :

- ئەوە بۆ دانانیشن بە قوربانی دایکە هەڵگیراوەکانتان ئەبم ! یان کرمەکەتان کەوتۆتە جووڵە جووڵ ئارەزوی ئاو پیاوان ئەکەن هێشتا ڕۆژ زۆری ماوە بە وەشدا ئەگەن مەترسن !

کەڵەگەتەکەیان سپی کەلەیەك بوو دەم و چاو درێژ کۆڵەی ژاکاوی چاو کاڵ بە زەردەخەنەیەکی شەرماوییەوە ووتی :

ئاخرپووره ئامینە شەرتەکەمان چی بور کە لەگەڵت هاتین ؟ ئەمان ووت لەسەر جنێودانمان ئەکردبێ ؟ کەچی تۆ وا خەریکی لە ئێستاوە دەست پێ ئەکەی !

پوورە ئامینە بەسەر بادانێکەوە ووتی :

- ئەرێ بە خوا کچۆڵەی نەرم و نیان ! حەیاو ئامووستان لێ ئەتکێ ، ئەگەر ئەم دیبایە دایکتان ئەمردم لە عەززەت باوکتان ! کچێ دەدانیشن با ئەم جگەرەیە بکێشم و دوو قسە لەگەڵ ژنەکە بکەین . ( ئینجا دوای کردە گوڵناز کە لەو کاتەدا بەپێوە بوو خەریك بوو ئەچووە دەرێ ) ووتی :

- دەك لەبەرتۆش مەرم ئەوەژوورەکەمان بۆ چۆڵ ئەکەی ؟ دایکم خۆ گوڵناز گورج قسەکەی پێ بری : ووتی :

- ئەی ئەچم چایەکتان بۆ لێبنێم ؟ خورشە بە ناخێری لە بەیانییەوە چووە بۆ ماڵی خاڵم ، هەواڵێکیان بزانێ ، ئەڵێن شەوێ ماڵی ئەوانیشیان پشکنیوە کەچی وا هەر نەهاتەوە

- ئەو چەتیوانە هەروا سەرە ڕۆ و کۆڵان کوتن ! تۆ وەرە جارێ کەسمان چا ناخۆین . ئێستە زۆر



ئـــەویش بـــە لۆقـــە کۆڵانـــە تەنگەبەرەکەی خۆیانی بڕی ، لە دڵیـا پـەژارە و خۆشـی پێکـەوە قوڵپیان ئەدا ئەویان بۆ ژان و ئازاری کاڵێ ئەمیشیان بۆ ئـەو منالەی کەئەیان بێ ، بێ گومان مەسرەفێکی باشیشم ئـەبێ بـە توو ەوە ! بە تایبەتی خۆ ئەگەر کـوڕی بـێ ئـەبێ ئاهـەنگی بـۆ بکا وای کە خۆ ڕزگار کردن لە دەست بیروباوەڕی کۆن گرانـە ! هەر ئێستا ئەم گاڵتەی بە ئەقڵی کـاڵێ ئـەکرد کـە کـوڕی پـێ خۆشترە لە کچ ، کەچی واخۆشی بیر لەوە ئەکاتەوە کەئەگەر کوڕی بێ ئاهەنگی بۆ ئەکا ! ڕەنگە ژن ئەوەندە گلەیی لێ ئەکرێ کە حەز بە کوڕ زیاتر بکا لە کچ ، چونکە خـۆی چێشـتوویەتی ، ئـەزانێ ئافرەت ، بە تایبەتی لای ئێمە ، چەند بەشخوراو و زۆرلێکراو و چەوسێنراوەن . بۆیە هەستێکی ئاساییە کە پێی خۆش ئەبێ کـزەی جەرگەکـەی لەبەشـە زۆر لێکـــراوە چەوســـێنراوەکەی مرۆڤایـەتی بـێ . بـەلام ئـەمی

پیاوی خوێندەواری تێگەیشتوو ، بۆچی؟ سـەرێکی باداو لەبـەر خۆیەوە ووتی :

- کەرانەی ئەم ڕەنییە بێ جێیەم شەرت بێ ئەگەر کچم ببێ ئاهەنگێکی لەهی کوڕان خۆشتری بۆ بکەم ! لە پـڕ هەناســەیەکی هەڵکێشـــاو چاوێکی ، بۆ یەکەم جار ، بە دەورو بـەری خۆیـا گـێڕا. سـەری سـوڕما لـە چۆڵـی شـەقامەکە ، ئـەو شـەقامەی ئێوارانی تر خەڵك ڕێچکەیان تیا ئەبەست ، سـەیرتر لـە هـەمووش ئـەوەبوو کـە ئـەو خەڵکەی تـاك و تـەراش تـێ ئەپـەڕین ، لـە بـاتی ئـەوەی بەرەو ماڵ ببنـەوە هـەموو بە گورگە لۆقە ڕووەو بەردەرکی سەرا ئەڕۆیشتن ، بەچەشنێ کە ئەم لەگـەڵ خێرا ڕۆیین وپەلـە کردنیشـیا پێیـان نەئەگەیشـــت ، یـــەکێك دەرکەوت بەرەو ژوور ئەکشا ، هـەر لـە دوورەوە بەسـەرە ڕووتـاوەو کورتـە بنـەیی و

قەڵەوییەکـەیا ناسـییەوە . خـوا چـاکی کـات تۆفیقـە خڕەی جاسووس بەم تەنگی بانگی شێوانە بۆ کوێ ئەی کوتێ ؟ ئاخۆ وەکوو سەگی ڕاو دووی چ نێچیرێکیـــان خستووە ؟ بـەلام کـەس دیار نییە تا نێچیر بێ ، بێ گومان ئەچێ بـۆ ئـەوەی بە دیار ماڵێکەوە ،اوەستێ تا نیوەی شەو ژەندرمە ئـەدەن بە سـەریانا . دەی چییـەتی بەسـەریەوە !! سـەری بـە گۆڕی بابی خۆی و ئاغاشی . ئـەوە چییـەتی ڕێگاکـەی هەر لە بەرناچێ .

- ئێـوارەت بـاش کـاك جوامێر ، زووکە ڕەنگـە پیا نەگەی !

- بە چییا نەگەم ؟

تۆفیقە خڕە بە زەردەخەنەیـەکی ناشرین دانە خوار و خێچ و بە جگـەرە زەرد هەڵگـەڕاوەکانی پیشـان داو بـە دەنگێکـی بـەرز ووتی :

- بـە پـــلاو خواردنـــا گیانەکەم !

زۆر پێی گـران بـوو ئـەم ئێسـك قورسە پیسەی هاتە ڕێ ،وەکوو شتێ بە نیشانەیەکی باشی لێك نەدایەوە . بە دیبتییەکی سەیر دای گرت !

دەنگە دەنگ و گرمە گرم ئەهات لـەلای سـەراوە ، ئـەختێکی تـر پـێی هـەڵگرت ، گرمـەی بـژی و بڕوخـێی هـەزاران دەنگـی ، وەك هەرەسی کێوان ئەهاتە گوێ ، بە ڕاستی ئـەم ژان گرتنـەی کـاڵێ دەبـەنگی کـردووە ! چۆن بـیری نەمابوو کەوا ئەم ئێوارەیە لەبەر دەرکـــی ســـەرا یـــەکێ لـــەو کۆبوونەوەو خۆپیشاندانانە هەیە کە لـە ژێـر سـەرکردەی ( پـارتی ڕزگـاری ) دا لـە چـەند مـانگی دوایـیدا ڕێـك ئـەخران ؟! بـۆ گەیشتنە مـاڵی مامانەکە نزیـك تریـن ڕێگـا شـەقامی بـوو کـە بەبەردەرکی سەرادا تێئەپەڕی ، بـەلام تـا نزیکتر ئـەبووەوە لـەو شـــەقامە ، پـــەنگاوی خـــەڵك لەسەری کۆلانەکانا باشتر تـێی ئەگەیاند کە لە وزەی کەسا نییە بتوانـێ دڕ بـەو عەشـامە بـدات

نیە چامان خواردۆتـەوە ، دانیشـە دوو قسـەم بـۆ بکـە بـزانم چـۆن ئـەریمانیان گـرت ، بەســەرەکەی ئەریمان بە گۆڕی ئەو جوانەمەرگە ناویـان لەیـەك دووریـێ بـە قـەی دنیایـەکم پێنـاخۆش بـوو ، کـە بیستم گـیراوە . هـەروا سەریشم سوڕما چی گەیاندیـەوە ئـێرە لەم ئـاخوران و بخورانـەدا ، ئەگـەر بەختە ڕەشی دایکی ئەبێ !

هـاوڕێ کەڵەگەتەکـەی (( ئامـە خـان )) سـەری لێ ئەباتـە پێشـێ کە قسـەیە بـە گوێیـا بچرپێنـێ . ئـەویش بـە پـاڵێ دووری ئەخاتەوە و ئەڵێ : چرپە چرپی بۆچییە کچێ قسـەکەت چییـە بیکـە . ئەویش بە تەریقی ووتی :

- بە قسـەی خـەڵك کـاك ئـەریمان لـە بـەغداوە ناردراوەتـەوە بـۆ ئـەوەی خۆنواندنەکـــەی ئـــەم ئێوارەیـــە ڕێکخات ، بۆیە گیراوە !

ئامە هەڵی دایە وتی :

- ئەمە هەموو بەنگو باوی جاسوسە خوانەناسـەکانە کچەکـە بـەو خوایـە هیـچ غـیرەت نـەماوە . بەراستە داو بـە چەپـەدا منـاڵی خـەڵکی بـەگرتن ئـەدەن و مـاڵی خەڵك وێران ئەکەن ، کەچی یەکێ

نییـە بڵـێ بـەری چاوتـان کلـی پێوەیە ! دەك خوا هەڵی ئەگرێ !

گوڵناز خان ڕووی کردە کچەکەو ووتی :

- بـەلای منیشـەوە قسـەی ئامینـە خانە . تۆ بڵێی ئەم شارە یەکێکی تیا ئەبێ خۆ نواندنێك ڕێك بخات ؟ پێویستیان بەوەبێت کەلە بەغداوە ئـەریمانی بـۆ بنـێرن ، ئـەکچم هەمووی بڕوبیانووە ، دوێنێ پاش نیوەڕۆ بە بۆنەی ووچانی نیوەی ساڵەوە هاتۆتـەوە . ئـەختێ چووە دەرەوە و هـەر ئێوارە زوو هاتـەوە ووتـی ( لـە ڕێگـە مـاندوو بـووم خەوم دێت ) نزیکی نیوە شەو بوو هاتن گرتیان و بردیان . ئیتر لـەوە زیاتری لێ ئازانم . لەگەڵ ئەوەشدا ، خـۆ سـەری ئـەریمان لای شـاوە ئـەهاتووە ئـەویش وەکـو منداڵـی ئەو هـەموو خەڵکەی کـەبێ تـاوان خراونەتـە بەندیخانـەوە ، سـەرێ لەناو سەرانا ئەبێ بۆ بڕین چاکە . توخوا وانیە پوورە ئامە خان ؟

پوورە ئامینەش ووتی :

ئـەم تـڕە کەڵەکنیـە سـەر نـاگرێ وا ئـەریمان و هـەزاری وەکـو ئـەریمانیان گرت ، خۆ ئیشەڵلا قڕ ناخەنە عالـەم ؟ هەر چی کونی لە گەروودایە ئەڵێ ئـەم

دەزگا و دووکانە بپێچیتەوە ، دەخوا بە قسـەی دەی ئـەکرد بـە قسـەی سـەدی ئەکرد بە قسەی هەزاری ئەکرد ئـاخری ئـەوەندە زۆر ئـەبن هـەر بـە قسـەیان ئەکات !

کچە کەڵەگەتەکە ووتی :

- پوورە ئامینە ئـاخر ئیش هـەر بە دوعـا ناچێتـە سـەر : پێشـینان ووتویانـە ئەگـەر بـە دوعـا ئـەبوو پشقڵ بە خورما ئەبوو

پـوورە ئامینـە خـۆی باداو ڕووی کـردە کچەکە و ووتی :

ئا بەقوربانی ئایشـێ سیلاوی دایکـت ئەبم تۆشم بۆ بچۆرە سەر دینی کابرا : بە دوعا هیچ نابێ ، بـەنزا هیـچ ناکرێ ئەستەخفیرەڵلا خـوا کێیـەو پێغەمبـەر کێیە ؟ باشە ئەی بڕوخێ و بژی دوعا نییە چییە ؟ئاوا چ تفەنگ و تۆپێکی لە دواوەیە ؟

کچەکە ووتی :

پـوورێ گیـان لەسـەر تـووڕە بوونمـان نەکردبێ ! من دشکەم ئیـتر قڕو قـەپ !

گوڵنـاز کـە ئەیویسـت ژوورەکـەیان بـۆ چۆڵ کات ووتی :

- چـۆن ئـەو کچـە دەستەرەسـتانی کـردم ، ئامـە خـان گیـان جگـەرە کێشێکم پـێ نـاچێ هـەر ئێستە

پیاڵەیـە چاییتـان بـۆ لێ ئـەنێم و دێمەوە لاتان .

- باشە بەلام درەنگت پـێ ئـەچێت ئـابینی کچـەکانم کێـچ چۆتـە کەوڵیان بۆ موزاهەرە

گوڵنـاز چـووە دەرێ ، ئامـە ڕەشـەبا رووی کردە هەڤاڵـەکانی و بە ئەسپایی پێی ووتن :

- کچی باش بن گەرم لێ لادەن ، خۆم لە خۆمدا پڕم با داخەکەم بە ئێوە ئەڕێژم ، سەرم لێ مەشێوێنن . دانیشن بۆ خۆتان بێدەنگ گوێ بگـرن ، ئێستە گرتنـی کوڕەکـەی لـە بـیر گوڵنـاز ئەبەمـەوە کـارێکی وەهـای پێئەکـەم ، بـە ژنـی زۆرابە دزە . هەر دانیشت و دائەنیشت داوای کۆڵوانـە جەفتەکـەی لێ ئەکـەم ئەویش نایدا چونکە هەمووی مانگێکە کەوایەکم لێسـەندووە ... ئینجا منیش خۆمی لێ شێت ئەکەم هەرچی ئەشیایە و ئەبیایـە پـێی ئەکـەم ئەوسـا کۆڵوانەکەشی پێ لـەکۆڵ ئەکەمـەوە و ئەشی دەم بە تـۆ قـاڵوە ڕەشکە ، کچە ڕەشکەڵەکەشیان کە ناوی ( سلمە ) بوو ووتی :

- ئـە پـوورێ گیـان مـن ئامـەوێ گونـاحت ئـەگات ژنەکـە کۆسـتی کەوتووە وەختی ئەوە نییە .

وبەزوویی و ئاسانی بگاتە ئەو شوێنەی ئەم بۆی ئەچێت ، ئیستێکی کرد وچاوێکی بە شەپۆلی خەڵکەکەی بەردەمیا گێرا ، دیی لەومەیدانە زلەدا خەڵکی وەك ئەمام چەقیون ، هەر ئەوەندەش ئەجوڵێنەوە کە ئەمام بە بای شەماڵ ئەشنێتەوە ، بە هارە هارِی چەپڵە لێدانی خەڵکەکەدا بۆی دەرکەوت کەوا یەکێك قسەیان بۆ ئەکات بێ ئەوەی بزانێ چی ئەڵێت ، لەگەڵ ئەوەشا ئەوەندە بە تەنگەوە نەبوو کە گوێی بۆ هەڵخات ، زۆری پەلە بوو .

هەتا ئەهات پاڵە پەستۆی خەڵکی لە دەوری پتر ئەبوو ، ئەختێکیکەی پێ ناچێ ئەویش ئەبێ بەئەمامێ وەکوو ئەوانی تر بەڵام ئەء . نابێ ئەو وای لێ بێ ! کاڵێ بە دەم ژانەوە ئەتلێتەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەمە ، ئای چەند سەیر ئەبێ تا ئەمان ئەگەڕێنەوە کوڕێکی جوانکەلەی بووبێ ! چییە ؟ هیچ سەیر نیە ! زۆر

ژنی کۆچەر هەر بەرێوە منالیان ئەبێ ! هەرچی چۆنێ بێ ئەبێ ئەم بچێ بە دووی مامانەکەدا و بە زوویی بگەڕێتەوە ماڵێ .

پاشەو پاش گەڕایەوە هەرچی چۆنێ بوو بە هەزار حاڵ توانیی سەد هەنگاوێك بێتە دواوە و خۆی بگەیەنێتە تەنکاو . شادی و هیوا و بێ ئارامی وەك پەلکەزێڕینە لەئاسمانی دڵیا دیاریان ئەدا ، بەڵام چاوتروکانێك زیاتر پێوەی ئەمایەوە بەر لەوەی چەند هەنگاوێ بە سەربەستی هەڵبنێ شریخ و هووڕی شەستیر هەموو گیانی هێنایە لەرزین ، ئەك هەر لەترسا ، زۆرتری لە شپرزەیی و ناچاریدا . جەستەی کاڵێ‌ی هاتەوە بەر چاو چۆن لە ژوورەکەدا گەوز ئەدات گرنگی فەرمانەکەی و تاریکیی ئەنجامی دواکەوتنی ، سەدان ئەوەندە لەلا زلتر و ئاشکرا تر بوو ، بە هەموو هێزی خۆی کەوتە ڕاکردن بەرەو سەری ئەو کۆڵانەی کە ئەی توانی بە چەند

دەقیقەیەك لێوەی پێنچ بکاتەوە بۆ هاتنەوە سەر ئەو شەقامەی ئەچێ بۆ ماڵی مامانەکە لەوانەیە ئەوێش جمەی بێ ! باشە بۆ ئەچێ بە دووی مامانێکی ترا بەڵام کێ ئەناسێ ؟ کەی ئێستا کاتی بە شوێن خەڵکا گەڕانە، ئەگەر ناچاری ئەبێ ؟ دوور نیە بەم ناخۆران و بخۆرانەوە باجی پیرۆزیش لەگەڵی ئەیەت ، کەوا ناسیاوی چەند ساڵەی بنەماڵەی خەزوورانی بووە ، بەر لەوەی ڕۆژگار دەربەدەریان کا ، بێ گومان هیچ مامانێکی ئەناسیاو هەر دەرگاشی بۆ ناقڵیشێنێتەوە لەم ڕۆژەدا . دەستڕێژی تازەی شەستیر و تفەنگ زنجیرەی بیر کردنەوەیان پساند ، ئەوەندەی ئەخایاند هەستی بە تریەی پێ‌یەکی زۆرکرد لە دوایەوە دێ ، کە ئاوڕی دایەوە دیی بەشێ لە جەماوەری بڵاوەپێکراوی کۆبوونەوەکە بە دوویا ڕانەکەن ، چەند هەنگاوێکیان ئەماوە بیگەنێ و لیشی تێپەڕ بن و ئەم تاقە ڕێگایەشی لێ بگیرێ ، چاوی

برییە ئەرزەکە و هەموو گوڕو هێزی لاوێتی دایە لاقی ، بەڵام هەستی ئەکرد خەڵکەکە هەر لێی نزیك ئەبوونەوە ، ئەوەندە ترسی لێ نیشتبوو بە چەشنێ ڕێی ئەکرد ئەتوت خەڵکەکە بۆ گرتن یا بۆ کوشتنی ئەو دووی کەوتوون .بەڵام هەر بێ هوودە بوو ، بە تیلایی چاو سەیری ئەکرد ، دیی وا هەندێك گەیشتنە سەری و خەریکن لێشی تێ‌پەڕبن ، لە پڕ شریخەی شەستیرێکی نزیك سڵەماندی‌یەوە پیاوێکیش دەم بە هاوارەوە لە تەنیشتیەوە کەوتە زەوی، ئەخێر زامار لەیەك ودوو تێ‌پەڕی کرد ، سەری بەرز کردەوە بۆنەو شوێنە بگەڕێ کە شەستیرەکەی لێ دامەزرێنرا بوو ، ڕوانی لە پەنجەرەیەکی ژێر خانی کتێبخانەی گشتی‌دا ، کەوا بە چەقی کۆڵانەکەدا ئەی ڕوانی سەری ژەندرمەیەك دیارە ، بێ‌ترس لوولەی شەستیرەکەی بەردەمی بە خەڵکا ئەگێڕێ جاروبار گوللە پڕژێنێکی شەقامەکە ئەکا ، ساکێ بەرکەوت

- کچێ وس ! تۆ گوناح پیشانی من مەدە بچۆ ها قسەم پێ‌مەکە لێم گەڕێن ، ئێوە هەقتان ئەبێ ! بەسەر یەکمانەوە هەیە ، ڕێوی کونێکین . ئەوە وا مەبینن کە ئەو لەناز و نیعمەتا بووە عومری پێوە دیار نییە ، بەلای کەمەوە شەش ، حەوت ساڵ لەمن گەورەترە ، هەر شەوە قەبرێ بناسیت کاکلی بایز ، ئەو پارە و دەوڵەتی باوکمی لە بن ئەهێنایە سامانی ئەوڵا خان لە بن ئەهات ؟ بە ناخێری گیانم حەزم لێکرد باوکم و دایکم تیاما کول و کافر بڕون ، شووی پێ ئەکەم ، چەند پیاوی گەورە گەورە ! چەند کوڕی قۆز قۆز هاتنە خوازبێنیم دەستم شکێ هەر چلمیشم پیا ئەدان ، ووتم خوا یەکەو یاریش یەکە .

لێرەدا کچە کەڵەگەتەکەیان خەریك بوو پێ بنێ لەجەرگی خۆی و لێی پرسێت (( توخوا پووره ئامە خان گیان ئەوساش هەر تەنیا یەکێك لە چاوە جوانەکانت ئەدرەوشانەوە ؟ )) ئەیزانی هەزار و یەك جنێویشی پێ ئەدات بەڵام هیچ ئەبێ جارێك جنێوەکانی لەسەر هەق بێ . هاتنە ژوورەوەی گوڵناز بەسەماوەری لە کوڵەوە هەردوکیانی لە

خەیاڵدا ، لەگەڵ ئەوەشا کە هاوڕێکانی (( ئامە ڕەشەبا )) لەناوی خۆی زیاتریان ئەئەزانی بەڵام بە زۆر فرێنی پێشووی و بێدەنگی دوای هاتنە ژوورەوەی گوڵناز خانا بۆیان دەرکەوت کە قسەکانی درۆن ، بۆیە ویستیان پێ‌ی تەواو کەن . سەلمەیان بە دەنگێکی ئاسکی خۆش ووتی :

- ئێ پووره ئامە خان گیان باسەکەت گەیشتە ئەوەی کە چەند لاوی قۆز قۆز هاتنە خواز بێنیت هەر چلمەکەشت پیانەدان ئێ‌ی ؟ دەی توخوا باسەکەمان بۆ تەواوکە زۆر خۆشە !

پووره ئامینە زانی کە سەلمە خەریکە چاڵی بۆ هەڵئەکەنێ پەنجەی دۆشاو مژەی چەپی خستە لای لوتی و چەناگەی خستە سەر پەنجەکانی‌کەی دەستی چەپی و بەلاتریسکە ڕوانییە کچە و قیڕانی :

- ئەرێ ئەوە قاژوە ڕەشە تۆ بۆوا هار بووی ؟ وادیارە لە دیوەخانەکەی فاتە دەرگاو دوو تری دایکتا زۆر حەکایەت خوێنی وەکو منتان بووە ؟ لە پڕ دەنگی گۆڕاو بە کەساسی‌یەوە وەك لاواندنەوە ووتی : تا خوا ڕۆژی بەم ڕۆژە ئەگەیاندبووم خانمی

ماڵی خۆم بووم ، بەڵام بڵێم چی لەگەڵ کاری خوا ... گوڵناز بە هەل زانی بگاتە فریای بەشکو بە چاکە لالی کات ئەی پەرژێتە سەر ئەو ، بۆیە بەپەرۆشەوە ووتی : ئەوە چی‌یە ئامە خان گیان ؟ بۆچی دڵت سەغڵەت بوو ؟ کێ ناماقوڵی کردووە لە خزمەتتا ؟! هەردوو کچەکە بەیەك دەنگ ووتیان :

- بەخوا دایکم کەسمان ، کەس ڕایەی ناکەوێ قسە بەو بڵێ ( تەماشایەکی یەکتریان کرد ) تۆیە لەمەش تۆیەش . هەستە کچێ با بڕۆین . بەزیای خێرم ئەکرد خۆ سەرەڕای ئەو هەموو جنێوو توانجانەش هێشتا ئەو خۆی عاجز ئەکات .

- ئەوە چی ئەڵێن ، ڕۆیِنی چی ؟ بەسەری ئەو ئەریمانە چایەکە ئەخۆنەوە و پێکەوە بە ئاشتی و دۆستی چۆن هاتوون وا ئەڕۆنە دەرێ هەتا ماوم ئاتان ئاسم (( ئای لەم فیشالە ..! ئاسینی چی کەی ئەیان ئاسم ! جگەلە ئامە ڕەشەبا کە بە زۆر و بۆ سەرانە سەندن ناسیاوی خۆی بەسەر هەموو شارەکەدا بڕیوە ، لەگەڵ ئەو دوو

کچە هەرباوکیشمان لە مزگەوتێکا نوێژیان ئەکردووە . بەڵام ئەوە هیچ نییە گرنگ ئەوەیە کە هەر سێکیان پێکەوە بڕۆن . ئەگینا بڕۆن و ئامە ڕەشەبا بە تەنیا بە جێ بهێڵن بە مەرەیەکی ئەبات داخی گیرانی ئەریمانی لە بیر بیاتەوە

- فەرموون دانیشن ، بەو خوایە کەمە ناڕۆن ، ئامە خان گیان ! دە تۆ پێیان بڵێ ... زۆر شورەییە چۆن ئەبێ بە زوویی ماڵەکە بەجێ‌بهێڵن ؟!

ئامە خان کەدی گوڵناز ڕووی خۆشە و حەز ئەکات ئەڕۆن ، ئەویش بۆ دەسکەوتی خۆی ، وای بە باشتر زانی کە بیانهێڵێتەوە ، بۆیە ڕووی تێکردن و ووتی :

- ئەوە چی‌یە کچێ ؟ بە ڕاستتانە ؟ بە گۆڕی جوانەمەرگەکە بەجێم بهێڵن لێشتان عاجز ئەبم و ئەشتان کەم بە پەنگی حەو مەملەکەت . دانیشنەوە دەی ! باشە لەبەر دڵی ئێوە باسی خوازبێنی کردنەکەی خۆشمتان بۆ ئەگێڕمەوە ئەزانم کچ لەو باسانە تێر نابێ حەزی لێ ئەکات ! باباسی ئامە کوێریش بێت ! کچم

خۆی و بەختی ! ژنێك لەولای ئەمەوە پەلی منالێکی ڕانەکێشا زریکانی و کەوتە زەوی ، شەستیرەکە کپ بوو ، کابرای ژەندرمە سەریشی بەسەریا شۆڕ کردبۆوە کەچی نەی‌نەتەقاند ! تۆبڵێی کوشتنی ژنە بێ تاوانەکەو هاواری منالەکە شلەژاندبێتی ؟ یا مشتومڕ لە نێوان ویژدان و پەنجەیا دەستی پێکردبوو ، وا دوو دڵ دەرنەکەوت ! وای کە نزیکە لێوەی ئێستە دەمانچەیەکی پێبوایە کاسەی سەری هەڵنەگرت . نەی زانی ئەم دوژمنایەتی‌یە توند و ڕقە زۆر کوتوپڕەی لەبەر ئەو زۆرداری‌یە بێ ئەندازە و ئاشکرایە بوو کە ئەی دی ، یا بۆ خۆڕزگار کردن بوو لەو مەترسی‌یەی کە هەڕەشەی لە ژیانی خۆی و ئەنجامی فەرمانەکەی ئەکرد ! هەر چۆن بێ کاتی لێکۆڵینەوە نەبوو ، هەل دەست لە تەقە ڕاگرتنی ژەندرمەکەی قۆستەوە بەدوو قەڵەمبازی کار ئاسکانە خۆی گەیاندە پاڵ ئەو دیوارەی شەستیری کابرا نەی‌نەگرتەوە ، بەلام هێشتا ئەم نەی پەرژابووە سەر ئەوەش کەتەنانەت بە خۆشی‌ی ڕزگار بوون شاد ببێ ، دیی ژەندرمەیەکی تر لە پەنا کۆمەڵێ گونیە لمدا کە لە سەربانی مزگەوتی بەرامبەر بە کتێبخانەکە ڕیز کرابوو ملە قوتی‌ی بۆ ئەکات ، هەروا نزیکەی بیست هەنگاوێ بە بەریەوەیە ، حەپەسا ئەی زانی چی بکا ، ئەچووەوە ئەوبەری شەقامەکە ئەکەوتە بەر نیشانی ژەندرمەی پەنجەرەی کتێبخانەکە ، پاشە و پاش ئەگەڕایەوە لێشاوی خەڵکەکە وا پەنگی خواردبۆوە ماوەی گەڕانەوەی ئەمابوو بە ترسەوە سەرێکی هەڵبڕی بۆ سەربانەکەی بەرامبەری ، دیی کابرای ژەندرمە لوولەی تفەنگی ئاڕاستەی ئەم کردووە ! هەموولەشی بوو بە چاو و ئەویشی بڕیە تفەنگەکەی کابرا کەمەرگ لەکونی لوولەکەیەوە سەرە تاتکێ‌ی لێ ئەکرد ئەی ئەزانی چی بکا ، دانیشێ ؟ ڕابکا ؟ ئەە ماوەی هیچ ئەما هەر هیچ هەر ئەوەندەی پێ کرا دەستێکی بەرەو لوولەی تفەنگەکە بەرز کردەوە وەکوو ئەوەی بیەوێ لە خۆی لابدا . یا ترس ئەوەندەی لێ نزیك کردبۆوە لای وابێ دەستی ئەیگاتێ ، یا هەر لە شڵەژان و شپرزەیی‌دا بێ هۆش وای کرد . تەقەیە هاتە گوێ‌ی کپ بووێ ، هەستی گەرمایی‌یەکی کرد لەئەشکنجیا ، لاقی قورس بوو قورس بوو ئەوەندە قورس بوو هەرچی گوڕ هەیە دایە خۆی بۆی ئەجوولا . دنیای دەورو پشتی دیار و نادیار ، لەناو تەمومژێکا وەك لوولەی تفەنگێکی یەکجار گەورە هاتە پێش چاوی ، کە هەتا ئەهات ، بە خێرایی بروسکە بچوك ئەبۆوە ، کە ئەو ئەما ئەمیش بە تەواوی لە هۆش خۆی چوو ، تەنیا شتێ کە بە مێشکیا تێپەڕی ، شێوەی کاڵێ و تاقە داخی کە لە دڵی دەرنەچوو تاسەی پێگەیشتنەوەی بوو .

﴿٣﴾

جوامێر لە بیر کردنەوەدا گەیشتە ئێرە موچڕکەیەکی ئاودامانی وای پیا هات کە بە یەکجاری زنجیرەی بیرەوەری‌ی لێکترازاند ، ئیتر مات و خەمبار چاوی بڕیە ڕێگاکە و تا گەیشتە شاری(چ ) ئەلە دیمەنی بەلادا تێپەڕیوی ڕێ و بانا شتێکی تایبەتی سەرنجیان خەریك کرد ، نە جەمسەری بیرەوەریشی بۆ دۆزرایەوە کە وەکوو گولۆڵەی ئالۆزاوی لێ هاتبوو . ! لە بەردەمی دایەرەی ئاسایشا دابەزین ، بردیانە ژوورێ پاش چەند سەعاتێ ڕاگرتنی ناخۆشی پڕ بێزاری ، پەنجە مۆر و چەند وێنەیەکیان وەرگرت ، ناونیشان و کارو ناوی چەند ناسیاوو خزمێکی نزیکیان لێ پرسی و نووسی‌و دەستە بەریان کرد کە نابێ بە هیچ جۆرێ شوێنی

! خۆشەویستی هەر بە سووراو و سپیاوو چاو پڕ لە کل کردن و دەم و چاو هەڵگرتن ڕاناگیرێت ، ئافرەت وەکو مانگی چواردە وابێ کە ڕەوشت و خۆی جوان نەبوو تێ‌ی هەڵدە ... ها گوڵناز خان توخوا وانییە ؟

گوڵناز خان بەدەم چا دانانەوە ووتی :

- بەلێ بەلێ ، ئەی چۆن ؟ خۆ پێشینان بە خۆڕایی نەیان ووتوە جوانی بەد خوو وەکو گوڵی بۆن ناخۆش وایە ؟!!

ئامە ڕەشەبا قسەکەی قۆستەوە ووتی :

- ئەی سەد ڕەحمەت لە باوکت ، ئا لەمەم بۆ بڵێ ، قسە هەزارە و دوانی بە کارە ! ( ئەختێ گەروی پاك کردەوە و لە قسەکانی گوڵناز زاتی وەرگرت ووتی :

- لەگەڵ گوڵناز خان دەستە خوشکین ، ئای کوێرایيم دایە بۆ ئەو زەمانە ! چەند جار ئەولاخانی باوکم گرتوێتە باوەش و گیرفانە بچکۆلەکانی پڕکردووە لە نوقڵی‌ترش و شیرین . هەروەها مارف ئاغای بەهەشتی باوکی ئەویش من و گوڵنازی بە یەك چاو تەماشا ئەکرد ... بیرتە گوڵناز ؟ ئەو ساڵەپێشەنگی کاروانەکەمان جووتەیەکی بۆ داوەشانیتەوە ئەگەر باوکم وەك بروسکە ئەهاتایە دەست بە حەوتیرەکەی هەردوو پاشووی تێکشکێنێ ئێستە ئێسقانیشت ئەمابوو ! جا کچینە لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو گوڵناز چونکە ئاگای لەو جووتە کوشندەیە ئەبوو بوو ، لە تەقەکە زیاتر تۆقی بوو ، هەر بۆیان ژێر نە ئەکرایەوە ... ئای کە بیری منالی تیژە ... لە گوڵنازی هەژاریشی پرسی کە دەمی بوو بوو بە تەڵەی تەقیوو (( ها گوڵناز لە بیرتە ؟ )) . ئەویش وەك لە خەوا قسە بکا ووتی :

- بەلێ ، بەلێ زۆر چاك لە بیرمە ، وا ئەزانم دوێنێ‌یە !... بالۆرە بایەکی بەسە ، ئامە خان کردی بە بازاڕی خۆی کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی خوازبێنی و ژن و مێردی خۆی و کاکلی بایز و چارە ڕەشی خۆی بەدەست ئەو دڕندە قومارکەرە دەست بڕەوە کە دوای ئەوەی هەرچی هەبوو لە دەستی دەرهێناو بە قومار و داوێن پیسی دای لە دەست ، ئینجا کوڕەکەشیان کە تەنیا شتی خۆشەویستی ناو کۆزی بوو کەدڵیان لە دەوری کۆبێتەوە ، خوا ئەویشی لێ سەندەوە کابراش سێ بەردی نایە دەستی ئەم و ، خوا ئەناس ئەیهێشت چلەی ئەو جوانەمەرگەیان بەسەر بچێ بە ڕووی سوورەوە کردیە کۆلانان لە شاری بێگانەدا ،، لەگەڵ قسەکان فرمێسك زەنگۆڵ بە زەنگۆڵ بە چاویا ئەهاتە خوارەوە و گوڵنازیش یەك لەسەر یەك دەستی شایەتی بۆ ئەدا بە ملا ... دوو کچە داماوەکەش ئەت ووت سەیری فلیمێکی سینەما ئەکەن ، واقیان ورمابوو ، دڵیان پڕ بوو بوو لە گریان و نقەیان لێوە ئەئەهات ...

ئەختێك بێدەنگ بوون لە پڕ ئامە خان بەرزە پێ ڕاست بووەوە ... هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو بە ئەسپایی وەکو ژنێکی کارامەی ڕێك و پێك ووتی :

- هەستن کچینە با بڕۆین دڵی ژنەکەشم خەفەتبار کرد ... بە ناشوکری ناڵێم هەمیشە ئەناڵێنێ بە دەست مێردی بێوەفاوە ، وا دوێنێ خوا ئەم کۆستەشی خست (( هەر سەرخۆش بێ گوڵناز گیان خەفەت نەخۆیت)) دەستە خرینەکەی کردە ملی و ئەم لاو ئەولای ماچ کرد و ڕووی کردە کچەکان و ووتی : خوا ئاگادارە ئێستەش لە خوشکی خۆم زیاتر خۆشم ئەوێت و حەز ئەکەم هەر لە خۆشیدا بێت (( هەناسەیەکی هەڵکێشا)) دەی دەرەنگە با بڕۆین ... ماڵ ئاوا گوڵناز گیان ...

کە گەیشتە سەری کۆلانەکە کچە کەڵەگەتەکەیان ووتی :

- ئەرێ پووری گیان ئێمە بۆچی چووین و چیمان کرد .؟

پووره ئامینە سەرێکی بادلو ووتی :

- دەی گوێ مەدەرێ ، ئەی بۆچی خەڵك پێم ئەڵێن ... ئامە ڕەشەبا یا ئامە شێت ...؟

کچەکە ووتی : باشە بەلام تۆ ووتت چەفتەیەکی کۆنی لێ ئەسێنم ... وەی کە جوان بوو ...

پووره ئامینە بەدەم هەنسکەوە ووتی :

- سەلمە ووتی ئامەوێت ، بۆ منیش ڕوویەکی ئەویست شتی وابگرمە کۆڵم ... بەرمالە کۆنەکەی خۆم بۆمن . لەسەد کۆڵوانەی چەفتە چاترە! لێی گەڕێ پیرۆز بەخاوەنی خۆی بێت ، هەر لەخۆی بەت!

دانیشتنی خۆی بگۆڕێ بەبێ ئەوەی پیشەکی ئاگاداری ئەوان بکا ، ئەوسا بەرەڵلایان کرد .
کە پێی خستە ئەو دیوی دایەرەکە ، باوڵە تەنەکە کۆنە بچکۆلەکەی دەستی دانا لەسەر ئەرزەکە ، چاوێکی گێڕا بە دورو پشتی خۆیا ، یەکەم جار ، دوای دە ساڵ خۆی دی‌یەوە بە تەنیا بەسەربەستی ئەڕوا بێ ئەوەی کەلەبچەی لە دەستا بێ‌و یاساوڵ بە سونگی‌یەوە لە پشتی‌یەوە بێ ! پڕ بە سی‌یەکانی هەوای پاکی هەڵمژی ، زەردەخەنەیەکی تەنك ، بۆ چاو تررووکانێ ، چارەی ترش و تاڵی ڕووناك کردەوە ، ئیتر پەرۆش و بێ ئارامی‌ی گەیشتنە هیوای کوڕی و کاڵێ‌ی ژنی هەموو شتێکی‌کەیان لەگیان و مێشکیا شاردەوە ، بەبێ ئەوەی ، تەنانەت ئەو گۆڕینە زۆرەی لەشەقامەکەو خانوو و دوکانەکانی ئەملاو ئەولاشیا رووی داوە ئەوەندەی تۆزێ سەرنجی ڕاکێشن یا گوێ بداتە دیمەنی کەژە ڕەنگاو ڕەنگەکەی بەرامبەری ، کە جاران دڵگیرترین دیمەن بوو لەلای ، کەوا ئاوابوونی خۆر تارایەکی ئەرخەوانی‌ی جوانیشی بەسەرا کێشا بوو، سەری داخست و چاوی بڕیە چەقی ڕێگاکە بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی تایبەتی‌ی تیا بەدی بکا ، بە گوڕژم و گوڕێکەوە کە هیچ لەلەشی لاوازی چاوەڕوان نەئەکرا خۆی ئەکوتا بەرەو ماڵ ! بیری لەو سەرسامی و خۆشی و گەشکەیە ئەکردەوە کەوا بەماڵا کردنی لەناکاوی ئەیخاتە دڵی ژن و کوڕەکەیەوە ، بەڵام نەء بێ‌گومان هیوا ئای ناسێ لێ‌ی دوور ئەکەوێتەوە ، بە خێسەوە ئەڕوانێتە ئەم بۆرە زەلامەی وا خەریکە خۆی ماچ ئەکا و دەست ئەکاتە ملی دایکی ! بە بەرچاوی ڕێشکیا تێ‌ئەپەڕێ کە کاڵێ بەدەنگێکی کپی بە فرمێسك ئاودراوەوە بانگی ئەکا (( وەرە هیوا گیان ئەوە بابەیە ! دەی دەستێ بکەرە ملی بابە ، ماچێکی بەرێ دەی ! )) ئەو بە دوو دڵی و نیوە ڕەزاوە و ئەمیش بە جۆش و پەرۆشێکی زۆرەوە لێك نزیك ئەبنەوە ، هیوا دەستە خەپە تۆڵەکانی ئەهاوێتە سەر شانی ئەمیش دەم ئەنێ بەلا ملیوە ، لە پێش ئەوەدا بکەوێتە هەڵمژینی ، تێر تێر بۆنی پێوە ئەکات ! نەء خۆ هیوا منالۆچکە نیە ، تەمەنی دە ساڵە ، لە هەموو شتێ تێ ئەگا ، بێ‌گومان دایکیشی ئەوەندە باسی ئەمی بۆ کردووە هەر کە چاوی پێ کەوت پەلاماری دەستی ئەدا ماچی ئەکا ، بەڵام نەء ئەم ئەوەندە گۆڕاوە لەوانەیە کاڵێ‌ی بەسەزمان خۆشی ئەی ناسێتەوە ئەخوازەڵا منالێکی وەکوو هیوا ! لێرەدا گەیشتە سەر ئەو کۆڵانەی کە ئەبوو پێچ بکاتەوە بۆ ماڵی خۆیان لە پڕ ڕەق ڕاوەستا و لە جێ‌ی خۆی ووشك بوو ، ماڵی چی و حاڵی چی ؟ ماڵ لە کوێ ماوە ؟ هاتەوەبیری کەوا زۆر لە مێژە لاوەی ئامۆزای بۆی نووسیوە ، ژن و کوڕەکەی بردۆتە ماڵی خۆیان ژێر خانێکی داونێ و خانوەکەی خۆشی بۆ داون بە کرێ ، لە کرێکەی مانگی دوودینارێ بۆ ئەم ئەنارد ئەوی‌کەشی لە خۆیان سەرف ئەکرد .
هەر وەکوو ئەم بیرکەوتنەوە ناکاوە لە خەیاڵی دابێ و لووتی شکاندبێ هێز و گوڕ لە لەشیا نەما ، گەڕایەوە دواوە قاچی بە کێش ئەکرد ، کەواتە بەیەك گەیشتنەوەکەیان هیچ ئەو تام و خۆشی‌یەی نابێت کەبە درێژایی شەش مانگی دوای زیندانیەکەی ئەم خۆی بۆ ئامادە ئەکات و خەیاڵی پێوە لێ ئەدا ، لەبەرچاوی لاوەو ژن و منالەکانی لە کوێ ڕووی دێ ئەو شتانە بکا و ئەو قسانەیان پێ بڵێ کەلە دڵیا گینگڵە ئەدەن ؟ هیچ .
- شتێکی ئاشکرایە کە تەنانەت ناتوانێ ماچێکی کاڵێ‌ش بکا ! دەی قەی چێکا ! خۆ دنیا هەر ئەو چەند دەقیقەیە نی‌یە کە تیایا بۆ یەکەمجار ، دوای

لەپڕ سەلمە کە لەپشتەوە ئەڕۆیشت بەڕاکردن گەڕایەوە ووتی :
- بەخوا قەوما ، هەر خەڵکەو بەرەو بەردەرکی سەرا ڕائەکات.... ئافرەتی چاك بن بابگەڕێینەوە ماڵی .... گوڵناز خان ، باتوشی گاشەیەك نەبین .
کچەکەی‌تر پاڵێکی پێوە ناو ووتی :
- نەك داوەشێیت بۆ خۆت و ترسنۆکیت ، ئەی گوایە ئێمە کەلە ماڵ هاتینە دەرێ بەچ نیازێك هاتین ... ها پوورە نامە خان توخوا وانیە ؟ پوورە نامە کەوا دیاربوو هێشتا باش ئەهاتبووەوە سەرخۆی بێ ئەوەی بزانێ کچەکە چی ووت ، ووتی :
- بەڵێ بەڵێ ، ڕاست ئەکات .
وای ووت و خێرا ..... وون بوون لەناو خەڵکەکەدا .

-٣-

گوڵناز بەتەنیا لەژووری دیوە خان دانیشتبوو، دەست و پەنجە باریکە سپی‌یەکانی بەسەر ژیلی مقەڵیەکەدا گرتبوو ، گیرانی ئەریمان ، قسەکانی نامە ڕەشەبا ، تەنیایی خۆیی و کشوماتی ژوورەکە و مەراقی ئەهاتنەوەی خورشە تارایەکی ماتەمینی‌یان بەسەروچاویا دابوو ...
- ئەرێ ئەو ژنە شێت بوو بوو چی ؟ مارفاغای باوکمی چی، ژنی تایەن ناوی باوکم نازانێ‌کەچی ئەیکات بەهاوڕێ‌ی باوکی و خۆشم ئەکات بەدەستە خوشکی خۆی ، خۆشیی ئەوە بوو کچەکان منیان بناسیایە و بیان و تایە ناوی باوکی هەباسی عەلیاغایە مارفاغا نی‌یە بێگومان دەستی ئەنایە بینیان و هاواری ئەهێنا بۆ من ، جاوەرە گوڵنازی داماو تۆش قسەی کچەکان سەرخەو ئەو بە درۆ بخەرەوە ، لەوانە بوو بڵێ بیسمیلا خۆ ئەو ژنە ناوی باوکی خۆشی لێ تێك چووە و هەموومانی ئەدایە بەر کلکان و شرت و شۆی لێ ئەبرین هەر چۆنێ بێ خوا ڕەحمی کرد وای کە ژنێکی بێ چاوو ڕووە ، هەر ئێرە حەیتەیەکە بۆ خۆی ، ئەم شارەی بە پیاوو ژنەوە کردۆتە کونەوە ، فەرمیدوون ئەیوت ئەو جارە چۆتە لای باوکی ئەریمان کراس و ئاوەڵ کراس و دەسماڵ و سەر پۆشی هەڵگرتووە و کە هاتۆتە سەر پارە دان پێ‌ی ووتوە وا بزانە یەکێ لە پیاو ڕفێنە بەیتەشەکان دەستیان بڕیت ، ئەڵێ‌ی چی ؟ باوکی ئەریمانیش چی بڵێ ! بۆ کە س ئەوێرێ لەشەکر تاڵتری پێ بڵێ . لە پاش ملەش هەریەکە زمانی درێژ ئەکەن شەش گەز ئەو ئەڵێ نامە کوێر ، ئەم ئەڵێ نامە شێت ئەویتر نامە ڕەشەبا و نامە تەڕە ماش و نامە تەڕە ساز ، ئەگەر غیرەتتان هەیە لە عاستی خۆی قسە بکەن ، لەپاش میران سەران ئەبڕن . بە ڕاستی ژنێکی سەیرە ، ئیمڕۆ خەیاڵی دابوە باوکی من و باوکی خۆی ئەو هەموو درۆیەی پێکەوەنا ، ئەوڵا خانی باوکی ؟ تۆ بڵێ‌ی باسی جوانەمەرگەکەشی هەر درۆبێ ؟ ئەی چۆن ئەو فرمێسکانە زەنگۆڵ زەنگۆڵ بە چاویا ئەهاتنە خوارەوە ! تۆ بڵێ‌ی بینینی من لە لاو دیوەخانی خۆما داخی ئەروونی ئەووروژاندبێ ؟ کە وا ئەوڵا کەچەڵی مەیتەری ماڵی میرزا شابانی بۆ کردمە ئەوڵا خانی خاوەن کۆشك و تەلار و کاروان و قەتار پیرێژنە فیشاڵکەرە خۆ هەڵکێشە ! دەستم شکێ چۆن ئەو هەموو شایەتی‌یە ناهەقەم بۆ دا ، لە خوا نەترسام و لەو کچانەش شەرمم نەکرد !! ئا گوڵناز ئەوە چییە ؟ ئەڵێ‌ی هەندێ جار دەماری کۆنە ئاغایەتیەکەت ئەتگرێ ؟ تۆ زۆر جار خۆت ئەڵێ‌ی کەوا لەوانەیە لەبن ئەو گێژەڵووکەیەی نامە ڕەشەبادا دڵێکی وەك ئاسمانی سامال پاك و خاوێن شار درابێتەوە زۆر زۆر چاکت کرد کە دڵیت ئازار نەدا ، تۆ چیت لە کیس چوو ؟ نەء کێ لەم ڕووی زەمینەدا ئەوەندەی گردێ زیانی پێ گەیی لە ڕووی ئەو درۆیانەی نامە و شایەتیەکەی تۆوە ؟ بەراستی ؟ وەی هەژ بەسەر ڕاستیی بۆچی ڕاستی خۆشی دەست و قاچمان ماچ ناکات ئەگەر هەر زیانی وای پێ بگەیەنێ کە بەتەنیا خۆی بنەنگێوێو تەنانەت پریشکیش بەر کەس نەکەوێ ؟ وە دڵی بە نیادەمیش خۆش کات ، دیت چۆن بەڵێ بەڵێ کانت کەفو کوڵی دامرانەوە ؟ چۆن ئەو ڕووە ترش و تاڵە ڕق و تووڕەیی لێ باریوە گەشایەوە ؟ چۆن دەم و دووی گۆڕا ، بێ قسە، بێ‌دەنگ ، بێ جنێو ، بێ سەرانە هەستا ، دەستی کردە ملت و ماچی کردی (( وای چ بۆ درێنێکی لێ ئەهات )) قەیناکە بەڵام خۆت گوێت لێ بوو بە چ دەنگێ پێ‌ی ووتی : ماڵ ئاوا گوڵناز گیان! ئە دەنگی ، ئە ڕەنگی فریان ئەمابوو بەسەرنامە ڕەشەباوە ، خۆ لە بیریشتە کە هەمووی مانگێ لەمەوبەر کەوایەکی ووشك سوورمەی لەبەر داکەندی کە هێشتا سەر قوڵەکانی ئەڕووشابوون ، کەچی هەتا گەیشتیشە سەری کۆڵانەکە قسەی وای پێ گووتی و ئاوو ئاتۆرەی وای لێ ئای بینێیتە سەر نان سەگ بۆنی پێوە ناکات .

دەساڵ ، چاویان بەیەك نەكەوێتەوە ژیانێكی دوورو درێژیان لە پێشە ، هەر ئەوەندەی هەیە كە خوا لە چورتم و تاوێری ڕۆژگار بیان پارێزێ ، بەڵام زۆر سەیرە چۆن بیری چوو بۆوە ، كە لەو ماڵەدا نەماون . بەدرێژایی چەند ساڵ لاوە لە نامەكانیا باسی ئەوە ئەكا كە هیواو دایكی لە ماڵی ئەوانن پێكەوە ئەژین .
ڕاست ملی ڕێگای گرت تا گەیشتە بەر ماڵی لاوە پاش ئەختێ سێو دوو بە دەستێكی لەرزۆك لە دەرگاكەی دا . دوای ئیستێكی باش كوڕێكی هەشت نۆ ساڵە دەرگای لێ كردەوە . كە چاوی پێی كەوت دڵی داخورپا ، تۆ بڵێی ئەمە هیوا بێ ! بە ڕاستی زۆر ڕێی تێ ئەچێ ئەوبێ .
گەلێ شێوەی لەو وێنەیەی هیوا ئەچێ كە بە منالی گیراوە . ئەو وێنە نازدارەی ، دوای گەلێ تكاو پاڕانەوە لاوەی ئامۆزای بە دزیی دەسەڵاتدارانی زیندانەوە گەیاندبوویە ئەم، ئەو وێنەیەی بە درێژایی چەند ساڵ هەر كەشەوی لێئەهات لە تویێ لیفەكەی دەری ئەهێنا و تا خەو بەلادا ئەی بردنەوە پێی ڕائەبواردو بەو تیشكە گەشە هێمنە پاكژی لە چاوە ڕەشە پێكەنیناوییەكانی هەڵ ئەقوڵا تاریكیی زیندانی ڕۆشن ئەكردەوە، و هێشتا دنیا تاریك و لێڵ بوو كە لە خەو ڕائەپەڕی و دیسانەوە لە تویێی لیفەكەیا بەباشی ئەی شاردەوە ؛ بۆ ئەوەی وەك وێنەكەی كالێ وەردیانە جانەوەرە دڵڕەقەكانی زیندانەكە ، لە پشكنینێكی ناكاوانەی دۆزنەوە و بە بەرچاوی خۆیەوە وەك دڕندە پارچە پارچەی ئەكەن
وای چ ڕێكەوتێكی خۆش ئەبێ هیوا گیان یەكەم چارەی ناسیاو بێ كە لەشاری ( چ ) چاوی پێی بكەوێ . منالەكە لە بێدەنگی و سەرنجان و واق وڕمانی ( كابرا ) بە ئەندازەیەك پەشۆكا خەریك بوو دەرگاكە داخاتەوە جوامێریش لەبەرخۆیەوە ئەی وت : هیوا ! هیوا ! منالەكە زیاتر شڵەژا و هەتا ئەهات دەموچاوی زیاتر نیشانەی ترسی لێ ئەنیشت بە تایبەتی كەدیی كابرای لە دەرگا دەردەستی گرتەوە بەتای دەرگاكەوە نایەڵێ پێوەی بداتەوە بە دەنگێكی پڕ ترسی نزیكتر لە هاوارەوە وتی :
–بۆ قسە ناكەیت مامە بڵێ چیت ئەوێ !
ئەم پرسیارە جوامێری لە چنگ شپرزەیی و بیركردنەوە ڕزگار كرد بە ئەسپایی بەبێ ئەوەی چاولە كوڕەكەی بتروكێنێ پرسیی :
- كاكە لاوە لە ماڵە ؟
- با بچم بزانم .
توند بە هەموو هێزی خۆی تای دەرگاكەی پێوەداو جوامێری بەحەپەساوی و شەرمەزاری لەدەرێ هێشتەوەو خۆیشی بەراكردن گەڕایەوە ماڵێ. جوامێر دوای ئەوەی گرمەی دەرگای پێوەدانی منالەكەی لە گوێچكەڕەوییەوە ، پشتی كردە دەرگاو مات و بێدەنگ ڕاوەستا . حەزی لە دەرگای داخراو نەئەكرد تەنانەت ئەگەر ئەم لە دیوی دەرەوەشی بێ . وادیار بوو دەساڵی بەندیخانەی ، دەساڵ ژیانی ناو زیندانی دەرگا خڕ داخراو كارێكی خراپی كردبوە سەر مێشكی ؛ چەند دەقیقەیەك وەها مایەوە بەلای جوامێرەوە لەچەند سەعاتێك درەنگتر تێپەڕی ، ترپەی ڕەوتێكی ئەختێ گرانی لێ نزیك بۆوە و دەرگا كرایەوە لاوەی ئامۆزای ، وەكوو دەساڵ لەمەوبەر چۆنی بەجێ هێشتبوو هەروا سوور و سپی وخڕپنە و ڕووگەش . لە بۆشایی دەرگاكەدا وەستا، تەنیا گۆڕانێك كە جوامێر لەسەر و چاویا بەدیی كرد چەند موویەكی سپی هەڵگەڕاو بوون؛ بەلاجانگیەوە ، كەوا لەناو مووە خورماییەكانی

لەگەڵ ئەمەشا گوڵناز سەری سووڕما بوو لەم گۆڕینە كتوپڕەی ژنە و هێشتا هەر گومانی هەبوو لەوەی كە شایەتییەكەی ئەم تاقە هۆی گۆڕینی نامە بوو بێ ئەیتوانی نرخی ڕاستەقینەی قسەكانی خۆی بە كێشی ئەو هەڵبسەنگێنێ و بزانێ كە لای نامە چەند لە هەموو ئەو شتانە بە نرختر و باشتر و پێویست تر و نایابترە كە ئەم خۆی ، یا خەڵكی تر تا ئێستا داویانەتێ و شتێكی وایە كە بە هەموو ڕوو هەڵماڵراوی و بەخۆدا ڕاپەڕموونییەوە هەتا ئێستە زاتی ئەكردووە لە كەسێ داوا بكات و ئەمرۆش داوای ئەئەكرد و پێی لەجەرگی خۆی ئەئەنا ئەگەر سەركردنە سەری كچەكەی هەقالی لێی نەكردایە بە كوردە ناموسی و تۆش ئەوەندەی خۆت بۆ شل نەكردایە ، بۆیە هیچ پەشیمان مەبە
لە پڕ تەق و تۆقێكی زۆر گوڵنازی داچڵەكاند ، بە پەلە جووتێ سۆڵكرد بەسەر پێوەو ڕای كرد بۆ لای دەرگای حەوشەكەیان بزانێ داخراوە (( بە تەنیایە با تووشی گاشە ئەبێ ئەو خورشە ناگر تێبەر بووە بۆ نەهاتەوە ؟ چەتیونكی هەڵەشەیە . خوا بكا شتێكی بەسەر نەهاتبێ )) پێش ئەوەی بگاتە لای دەرگاكە گوێی لە دەسترێژێكی نزیك و چەند تەقەیەكی تاكو تەرا بوو ، ترپە ترپ و ڕمە ڕمی ڕاكردنیش لە دەرگاكەیان نزیك ئەبوەوە لەگەڵ قاووقیژێكی زۆرا .. یەكێ قیڕانی : كوڕە وەرن بچینە ئەو ماڵە ، لێرەوە بەسەر بانا ناوقەد بڕ خۆمان ئەگەیەنینە كۆڵانی قەزازەكان و بۆی دەرئەچین!
یەكێك لەولاوە ووتی : وەرن باوكم وەرن ئەوە ماڵی (( زۆراب )) بەگە لەوانەیە تەلەفۆن بكات بۆ پۆلیسخانە بێن بتانگرن خاوەن دەنگییەكەم دەستێكی ماڵی بە دەرگاكەدا ووتی :
- ئێستە زۆراب كوا لە ماڵە ، گوڵناز خانی ژنی لێمان ئەكاتەوە خۆیشی ،كوڕەكەی گیراوە و ئافرەتێكی چاكیشە!. ئیتر قسەكەی بوو بە ژێر دەنگە دەنگ و قاوو قریشكی زۆرترەوە ، بەڵام گوڵناز خان ئەمەندەی بەس بوو كە دەرگاكەیان بۆ بخاتە سەر گازی پشت و بڵێ : فەرموون باوك و براكانم ، وەرنە ژوورەوە لێرەوە خۆتان دەرباز كەن گوڵناز ئەگەر خۆی لانەدایە ئەبوو بە ژێر دەست و پێی ئەو ژن و پیاوو منالانەوە كە وەكو لێشاو تا ئیمانی دەرگاكە ئەیگری بەو هەموو گوڕەوە كە ترس و غەریزەی ژیان پاراستن دابووینی كردیان بە ژوورا ، ملەما لە دالانەكە بڕا ، زریك و زاك دەستی پێكرد . هەندێ پونگانەوە بۆ ناو ژووری دیوەخانەكە و هەندێكیش لەتاو گیان و لەبەر پاڵەپەستۆی خۆیان كاتێكیان زانی چەند شووشەیەكی جامخانەی بەینی دالان و حەوشە هاڕەی كرد
هەندێك بە ئەها ئەها ئاگاتان لە خۆتان بێ زەرەر ئەدەن! دڵسۆزی خۆیان دەربڕی ، گوڵناز خانیش لە قوژبنی لای دەرگاكەوە ڕەنگ هەڵبزركاو بە دەمێكی ووشك خەریك بوو بڵێ دەی قەی ناكات خۆتان خۆش! بە قوربانی ئێوە بێ ، كەچی یەكێك ووتی :
- گوێی مەدەنێ هەمووی ماڵی خۆمانە ، گشتی پارەی دزێتییە ، گوڵناز وەكو شتێ قسەكەی لە بین گیرا ، تەماشایەكی كابرای قسەكەری كرد ، دیی كوڕێكی شەرواڵ و مراخانییەكی ڕەش لەبەری باریكەلەی چاو بزی سمێڵ قەیتانییە ، جێگای خەڵكەكە یەكجار تەنگ بوو یەكێك قیڕانی:
كوڕە نامەردتان ئەكەن ئەوە دەرگای جامخانەكە بۆ ناكەنەوە ئەم منالانە لە ژێر دەست و پێدا مردن با بچینە حەوشە تا ئەوەتا براكەمی ئەو ئاستەی خوارەوە ڕاكێشە تا ئەوە كرایەوە
- بەر دەرگاكە چۆڵكەن با پێوەی دەین، وا هاتن! یەكێ لەسەری كۆڵانەكەوە ، لە پێش كۆمەڵێكەوە هاواری كرد بیهێننە ئێرە ئەم ماڵە دەرگایان كراوەتەوە دایمەخن باوكم ، با ئەو زامارە بێننە ژوورێ ، زووكەن زوو ، ڕێ بە خۆتان بدەن تا پۆلیس ئەگەیشتۆتە سەرمان بەدەم ئەو شەپۆلە تازەیەوە ولەگەڵ كرانەوەی دەرگای دالانەكەدا كۆمەڵێكی زۆر ڕژانە حەوشەكەوە یەكێكیان كە وادیار بوو پێشڕەویان بوو هاواری كردنێ :
– خوشكینە ، براینە خێراكەن! و خۆی كەم ووره بوو ئەگینا گوللەكە نەرمەی ڕانی گرتبوو ، هەر هاتنە ژوورێ زوو هاوڕێكانی بە مشكی یەكەی برینەكەیان توند پێچاو یەكێكیان چووە ژێربالی ئەوانی تریش لە دوایەوە ، گوڵناز ڕێگەی سەربانی

کەدا سەرەتاتکێیەکی شەرمنانەیان ئەکرد! لاوە ڕوویەکی کەمێ گرژی تێ کردو بە دەنگێکی گڕەوە، لێی پرسی :

- ها برا چیت ئەوێ ؟

ئەمرێ ، خزمەتێ ؟!

جوامێر سەری سوڕما ، بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە کە هەر بۆ ئەوەی بوو تەریقیی خۆی بشارێتەوە ، ووتی :

- کاکە لاوە ! چۆن ؟ ئامناسیتەوە من جوامێرم. قسەکەی تەواو نەکرد بوو کە چارەی لاوە بەتەوژمی شەپۆلێکی شادمانی گەشایەوە ، بە دەنگێکی پڕ تاسەوە و ئارەزووی بە خۆشی و گریان ئاودراو ووتی :

- وەی جوامێر گیان ! لێم ببورە بە ڕاستی نەمناسیتەوە دەستیان ، کردە ملی یەك و ئەملاو ئەولای یەکتریان ماچ کرد ، لاوە دەستی گرت و بردیە ژووری میوان ، بە دەم گلەیی‌یەوە پێی وت :

- ئاخر کاکی خۆم ، نە ئەبوو لە هاتنەوەت ئاگادارمان بکەی ، بۆ وا لەناکاو ئەکەی بەماڵا ئەمە ئیشە ؟

جوامێر وتی :

- خۆت ئەزانی کە مانگی جارێك لە بەندیخانە ماوەیان ئەداین نامە بنێرین بۆ کەس و کارمان . منیش لە نووسراوی سەری مانگما بۆم نووسی بوویت کەوا لەم مانگەدا ڕزگارم ئەبێ ، ئیتر بە تەواویش نەم ئەزانی بۆ کوێ و کەی ئەمنێرن تا ئاگادارتان بکەم باش بوو خواو ڕاستان کردیان ،لەمەدا بەختم هەستابۆوە ئەرلە خۆیانەوە بێتکاو بێ پاکانە ئاردیانەوە ئێرە ، لەپاشا لەوانە بوو بشەرمزانیایە ئاگادارم نەکردنایە ، بۆ ئەوەی تووشی ئەزێتی بە پیرەوە هاتنتان نەکەم. لاوە قسەکەی لەدەم قۆستەوە و بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە وتی :

- نە بابە ، بە پیرەوە هاتنی چی ؟ وادیارە تۆ ئاگات لە دنیا نی‌یە بۆچی لەترسی ژەندرمە کەس ئەوێرێ دەرکەوێ ، ڕەنگە لەدە کەس یەکێ لەوانەی ئەتناسین لە شارا نەمابن ، یان گیراون ویراون بۆ زیندانەکان ، یان هەڵاتوون و چوونە شاخ ، لەسەر ئەمری فەرمانداری گشتی نابێ لە سێ کەس زیاتر پێکەوە بگەڕێن شەوانیش لە سەعات هەشتی ئێوارەوە تا شەشی بەیانی چوونە دەرەوە قەدەغەیە ، لەگەڵ ئەوەشا ئەم هەموو فەرمانە ناڕەوایانە کاری نەکردۆتە سەر چالاکی‌ی لەشکری ئازد کردنی نیشتمانی کە (( ل . ا . ن )) پێ ئەڵێن ، کەم شەو هەیە ئەدات بەسەر شارا ڕۆژێش نی‌یە لە کۆڵان و کووچەکانا چەند تەقەمەنی و نارنجۆکێ ئەهاوێژن و زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی لە دوژمن ئەدەن. لاوە ئەم قسانەی وەك یەکێکی بۆ سکاڵا کردن زۆرتینوو ، هەڵڕشت بۆ جوامێر ، بەڵام ئەم بێزارانە وتی :

- تۆ جارێ واز لەم قسانە بێنە ، ئەوەندەم لەم جۆرە قسەیە بیستووە گوێچکەم پڕ بووە ! کوا هیوا و دایکیم بۆ بانگ کە ، ئەوە چی‌یە ئەڵێی میوانی ژنتان هەیە وا منتان هێنایە ئێرە ؟

لاوە وەك لە ئاکاو زۆر دڵڕەقانە برینێکی کولێنرابێتەوە ڕەنگی هەڵبزرکا و گرژی و مۆنی‌یەکی ئازاراوی شاڵاویان بۆ چارەی هێنا ، بەڵام کە سەری هەڵبڕی دیی چاوی جوامێر چ پاڕانەوە و تاسە و ئارەزوویەکی لێ هەڵئەقوڵێ ، هەرچی هێز و گوڕ هەبوو لە گیانیا دایە خۆی ، بۆ ئەوەی بەشکو بتوانێ پیشان دان . ئەوەندەی پێئەچوو ماڵ تاقی تیا ئەما هەموو لە پشت سەربانەکەوە بۆی دەرچوون . ( ماڵی زۆراب کەوتبووە شوێنێکی سەیرەوە ، تەنیا ماڵ بوو لە کۆڵانێکی تایبەتیدا ، پشت خانوەکەیان کەلاوەی خانێکی گەورەی کۆن بوو لەبەر فرە بەشی و نەبوونیی هەندێ لە خاوەنەکانی هەروا مابوە وەو ماڵان و دوکاندارەکانی دەوروپشتی کردبویان بەسەرە نوێڵك ، خۆڵ و بەرد و شتی بێ کەڵکی واتیاکەڵەکە بوو بوو گەیشتبووە نزیکی کونسوانەکەی ماڵی زۆراب بۆیە هەر بگەیتایە سەربانەکەیان ، ئیتر بە بازێك یەنجا هەنگاوێکی قەد بڕ لای کەمی نزیکەی دەدەقیقە ڕۆیشتن لە کۆڵ ئەکەوت ئەت توانی خۆت بگەیێنیتە گەڕەکی دەرگەزێن و سەرکارێز جگە لەوەی کە ئەك هەر ڕزگار ئەبووی لە تێپەڕبوون بە بەردەمی نوختەیەکی پۆلیس و ڕۆیشتن بە یەکێ لە چڕترین شەقامەکانی شارا ، کە لە ڕۆژی وادا بە پۆلیس ئەتەنرا ، ڕاست ئەشچویتەوە بەردەمی دوو کۆڵانی باریکی تەسکی پێچاو پێچ کە هەریەکی دووان سیانێکی کەیان لێ ئەبێتەوە کە پۆلیس لە ڕۆژی وا ئاخوران و بخوران دا خۆیان لە قەرەی ئەئەدا ، بەینێ بوو تەق و تۆق ئەما بوو کەگوڵناز گەسکێکی گرت بە دەستەوە ووردە شووشەکانی ماڵیی و کردنیە تەنەکەی خۆڵەکەوە و پارچە زڵەکانیشی لە قوژبنێکا هەڵپەسارد تا لە پاشا فڕێی ئەدەن . ئەوجا ئەختێ قوڕیشی لە تەختەکانی دالانەکە سڕی و پاڵی لێ دایەوە و شایەتمانێکی هێناو کەوتە بیر کردنەوە : ئەگەر ئەمیش ژنی زۆراب نەبوایە ئێستا یەکێ ئەبوو لەو ژنانەی کەوا خەریکن بە سنگی رووت سونگی دوژمن بشکێنن

بێگومان لە ئاویاندا ئەبوو! ڕەنگە لە پێشی پێشیشەوە بوایە ، گوایە بۆ نەئەبوو ؟ کە ئەم کوردایەتیی ئەکرد زۆری ئەمانەی ئێستا هێشتا هەر لە دایکیش نەبوو بوون ، جگە لەمە وەکو ئەو خەڵکە ئەمیش کوڕی بە ناهەقی نا گوناە گیراوە . باشە ئەی بۆچی ئەچوو لەگەڵیان داوای بەرەڵلا کردنی حەپسەکان بکا؟ ئەگەر بچوایە چی ئەبوو؟ زۆراب سێ بەردی ئەنایە دەستی ، قیروسیا ، خەڵك لەم ڕێیەدا خۆی ئەدا بە کوشت! بەڵام ئەی خەڵکەکە چۆن تەماشایان ئەکرد ؟ تۆ بڵێی دڵیان لێ پیس نەکردایە و لێی نەکەوتنایە بەنگویاو ؟ هیچ بە دووری مەزانە ، ئەی بە گوێی خۆی ئەی بیست چی‌یان پێ ووت ئەو ماڵ کاولە (( دوور لە سەری ئەریمان )) ئەوەندە ئەنگە ویست و ڕەزا گرانە لای خەڵك ، لەوانەیە بە (( هو هاو ها بڕی )) شوێن ئەمیش بکەوتنایە ئەگەر بیان ئاسیایەوە ئا بە پێچەوانە لەوانە بوو پێشی بخەن ئەوە نی‌یە ئەریمان ، خۆ کوڕی زۆرابیشە بۆچی لە گەڵیانە

بێگومان گەلێ باوەڕیشی پی ئەکەن ئەگینا لەم کاتەدا ئەیان ئەناردەوە ( بە قسەی خەڵك ) بۆ ئەوەی ئەم خۆ دەرخستنانە ڕێکخات ئای ئای ئەوە بۆچی خۆم لە بیر چوەوە ئەوە ئەبوو هەر ئێستە کوڕەکە ووتی : گوڵناز خان ژنی چاکە دەرگامان لێ ئەکاتەوە بێ گومان ئەزانن کە من هاوبیری زۆراب نیم

بە ڕاست ئەم کابرایە بۆ خۆی کردوە بە شەیتان! پارە ئەمە ئەهێنێ ؟ کوا خۆ هەر ئەش کرۆزێتەوە . ئازانم ئەبێ خراپی‌یەکەی چی‌بێ وا خەڵك ڕقیان لێیەتی بڕواناکەم جاسووس بێت ، جاسووسی چی ئەکات ؟ ئەو لەبەر خواردنەوە و مێ بازی و پارە ئاگای لە چی هەیە تا بە حکومەتی بگەیێنێ ؟ لام وایە هەر قسەی تڕنە لە شوێنان . گاڵتەیان پێ ئەکات و قسەیان پێ ئەڵێ ناویان ئەبا ئەوانیش کە ئەیبیستنەوە ئاگر ئەگرن هەقیشیانە! زۆراب لە ڕیزی دوژمنا وەستاوە! کە جاسووسی ناکات لەبەر ئەوەیە کە لێی ناوەشێتەوە و پرسی ناکرێ ، ئەگینا با بزانێ سبەینێ خۆنوادنەکەی لە کوێوە دەست پێ ئەکات ، یان ڕۆنیێۆتاییێك لە فلان ماڵە ئەوسا قسە ناکات بەو خوایە بیست کەسی بەسەرەوە دانێن ئینجا ئەی گەیێنێتە موتەسەریف . لەبەر هیچ ئەبێ بۆ ئەوەی ئاگاداریی و دڵسۆزی خۆی پیشان بدات ، سەرەڕای ئەوەی کە حەزیشیان لێ ناکات ، خۆ قسەکانی لەگەڵ (( ئووری بەگ )) ئەوجارە کە لە بەغدا بووین ئەوان لە دیوەخانەکە دانیشتبوون بە جووتە، منیش لە ژوورەکەی (( مونا خانم )) خۆم ڕێك ئەخست ، وای چی‌یان بەو خەڵکە هەژارە ئەووت ، بە خوا دوژمنی خوێنەخوێنی بزوتنەوە ، ئیمپریالیزم خۆی هەر ئەوە ئەڵێ! بەڕاستی پیاوێکی سەیرە بە درێژایی شەڕ ئەوەندە لەسەر ئەڵمانی ئەکردەوە نازی‌یەکان خۆیان ئەیان ووت شکاین ئەم ئەیووت بە فێڵ وا ئەڵێن نزیکەی چوار ساڵ ئەو پیاوە لەگەڵ دۆستەکانی قرە قرو هەرایان بوو لەسەر ئەڵمان و سۆڤێت ، دوای شکانی ئەڵمان و ئاهومێد بوون لەسەر هەڵدانەوەی هەتلەر ، ئینگلیز و ئەمریکای کرد بە

تررووسکەیەکی ڕۆشنایی و خۆشی بخاتەوە ڕووی خۆی ، بەلاَم هەر زوو تێگەیشت کە تەقەلاکەی بێ سوودە بۆیە زیرەکانە گورج دەستی گرت بە چمکی قسەکەی دوایی جوامێرەوە ، ڕاست بۆوەو پشتی تێکرد و بە دەنگێکی گڕی لەرزۆك پێی ووت :

- ماڵێکی دراوسێمان میوانە بابچم بەشکو دەستێکیان پێوە بنێم. لاوە کە لای جوامێر هاتە دەرێ نیستێکی باشی بۆ کرد لە دالأنەکەدا تا نەختێ ڕەنگ و ڕووی هاتەوە سەر خۆی ئەوسا چووە ژووری دانیشتنی منالەکانی ، خەبەری هاتنەوەی جوامێری دانێ وپێ ووتن کە چایەکیان بۆ لێ بنێن و نانیش بۆ هەردووکیان هەڵگرن ، حەمامەکەش گەرم کەن بۆ جوامێر ، نەختێ چاویشی بە ژوورەکەو سەرو چاوی منالەکانا گێڕا ، مێشکی ئەوەندە خەریك بوو هیچیانی باش بەدی نەنەکرد ، نەی ئەزانی چەند وا ئەمێنێتەوە ئەگەر ژنەکەی نەی وتایە :

- کەواتە با بچم بەخێرهاتنێکی بکەم وبانگی کەمە ئێرە ، بۆچی لە دیوەخان بێ ، هەر ئەبوو لەڕێوە بهاتایە ئێرە خۆ ئەو بێگانە نی یە ، کێمان هەیە شەرمی لێ بکا ؟

لاوە وەکوو لە خەو ڕاست کرابێتەوە بە ژنەکەی وت :

- نەمەچۆ تۆ مەچۆ
وەرە جارێ قسەیەکت پێ بڵێم ئەوسا خۆم ئەچم ئەی هێنمە ئەم دیو. ژنەکەی بردە لایەکەوە چەند قسەیەکی بە گوێچکەیا چرپاند و گەڕایەوە بەرەو ژووری میوان .

کە جوامێر بە تەنیا لە ژوورەکەدا مایەوە ، لەگەڵ ئەو هەموو پەرۆش و بیرەوەرییە وروژاوەشیا نەی توانی سەرنجی خۆی لابدا لە گیرسانەوە بە ناو ماڵی جوان و ڕێك و گرانی دەورو پشتیەوە. لە دڵی خۆیا ووتی بێ گومان ئێستە لاوە حاڵی زۆر باشە ، ئەم ناو ماڵە بە نرخ و چاکە بە خۆڕایی نی یە ، منیش تووشی ئەم گاشەیە نەبوومایە ئێستا ماڵ و حاڵێکی باشم ئەبوو ، بەلاَم دیارە وەکوو لاوە نەئەبووم ئەو زیرەك بوو هەر زوو خۆی لە بەندو باوی مامۆستایەتی ڕزگار کرد، ئاخۆ ئێستا خەریکی چی بێ ، ئەژدیهایەکە بۆخۆی لە هوویە موویە ئەکاتەوە ! منیش ئەگیرامایە و لە کاتی خۆشیا پێش بخرامایە ئێستە مانگانەیەکی باشم ئەبوو وای سەیرە خۆ من وام زانیوە دێمەوە سەرسەروەت و سامانی بابم تا ئێستە هیچ بیرێکم لەوە نەکردۆتەوە بە چی ئەژیم !
خۆ فەرمانبەری ئەوە هیچ ، بشمەوێ بە پولێك ڕام ناگرنەوە

پەرۆشی چاو پێکەوتنەوەی هیواو کاڵێ هەموو شتێکی لەبیر بردوومەوە. بەم خەیاڵە دیسانەوە هاتەوە سەرباسی هیواو کاڵێ و دیسان هەموو شتێکی کەی لە بیر چۆوە و ئارامی لەبەر بڕایەوە !

کە لاوە هاتەوە ژووری میوان دیی جوامێر دەستی لە پشتەوە تێك ئالأندووە و وەك ڕابکات بەناو ژوورەکەدا دێت و دەچێ . لای جوامێر وابوو کە لاوە چووە یا دەست بە میوانەکانیانەوە بنێ و ئەم بەرێتە ئەو دیو ، یان کوڕو ژنەکەی بۆ بهێنێ بۆ ئەم دیو . کە دیی بە تەنیا گەڕایەوە و بێ دەنگ لە شوێنی خۆی دانیشتەوە ، وەختەبوو لێك بێتەوە ، ڕووی کردە لاوەو بە دەنگێکی بەرز کە خۆشی ناساز و بێ جێ هاتە گوێی شێرانی :

- کوا ئەوە تۆ بۆچی چوویتە ئەو دیو ؟ ئەی منالەکانت بۆ نەهێنا ، من خۆم پێ ناگیرێ تا میوانەکانتان ئەڕۆن.

شێری خۆی و نەیکردن بە گژ سۆڤێتدا و ڕژێمی سۆشیالیستی پێ تەفر و تونا ئەکردن ! لە گەرمەی ئەم سەرمایە داریەتی یەیدا کە خۆشی بە هەموو هێز و توانایەوەو لە هەموو ڕێیەکەوە خەریکی زیاد کردنی ئەو سەرمایەیە بوو کەلە شەڕا پەیدای کردبوو ، تا لەم کاتەدا کە کوردایەتی گەرم بوو زۆراب بووە یاریدەرێکی چالاکی (( حیزبی تەحەروڕ )) ئەبوو هەر بەوەیا بمناسی یایە کە پیاوێکی هەڵباز و خۆپەرستە و هەر لە دەسکەوتی خۆی ئەگەڕێ ، لە کاتێکدا کە بە دڵ لەسەر (( تەحروڕ)) ی ئەکردەوە کە چی دژی کۆمەڵە و حکومەتی (( مەهاباد )) بوو کەوا خۆی ئەیووت یارمەتی و ماوەدانی سۆڤێت دەستێکی درێژی هەبووە لە پێك هاتنیا

گوڵناز بە درێژایی کات چاوی بڕی بووە دەرگای کراوەی دیوەخانەکە بە بێ ئەوەی هیچ شتێکی تایبەتی ببینێ ، لە پڕ ڕاپەڕی و لەبەر خۆیەوە ووتی :

- ئەی گیان بە خوا شتێکی باشە ، ئێستە زۆراب بگەڕێتەوە و ئەم پەڵە خوێنانە ببینێت ، بە ڕاستی بەزممان خۆش ئەبێ ، ئەڵێی کوێر بووم چۆن نەهاتەوە بەر چاوم ؟ هەستاو بە پەلە ئەو پەلأنەی سڕی و چاوێکیشی بە کون و قوژبنی دالأنەکەدا گێڕا یەك دوو پەڵەی کەشی دۆزیەوە ، هەر چەندە هێشتا ڕۆشنایی ئەوەندە مابوو کە بە بێ چرا بتوانێ دالأنەکە بپشکنێ بەلاَم بۆ دڵنیایی چراکەی هەڵکرد و دیسانەوە بە خاوڵ و ئاوو سابوون کەوتەوە سڕینی پەڵە خوێناویەکان و گەڕان بۆ هی تر (( هەی ئاوجەرگی گەورەکانتان بە هەناری داتەکاو بێت! دوو ژن داوا بکات کوڕەکانیان بەردرێن ئەم کوشتارەی پێ ئەوێ ؟ هەر ئێستە بڵاوی ئەکەنەوە کەوا خەڵکەکە لە پێشا ئەوانیان داوەتە بەر بەرد جا گریمان وابوو ، ئەبێ چونکە دوو ئافرەت و چەند منالێك بەردی تێگرتوون ئەوان ئەم خەڵکە بدەنە بەر شەستیر ؟ گەر خۆشەویستیی و نیشتمانپەروەریی و گیانی مرۆڤایەتی پێگەیاندن وانەبێ چۆن ئەبێ ؟ دەك هەڵی پێچی ئەم دەزگا و دوکانە بەلاَم وەکو هەڤاڵەکەی پوورە ئامینە ووتی : دیارە هەر بە قسە هەڵناپێچرێ ، ئەمە تۆش یەکجار خەستی مەکەرەوە ، دڵت پڕە ئەگینا ئێستە هەر بە قسە نییە ، وەکو سەردەمی کوردایەتی یەکەی تۆ کە بریتی بوو لە: کوردی پەتی قسەکردن و چەند پەرتۆکەیەکی بە کوردی لەچاپ ئەدران تا ئەوساش هەروا ئەبوو ئەوە کوردایەتی ئێمەمانان بوو ئەگینا لەیەك کاتدا زەنگی دەرگاکە و لێدەرەکەشی خرانە کار

- ئێ ئێ ، ئەوە کێیە ڕاوەستە واهاتم

﴿٤﴾

گوڵناز لە لێدەری دەرگا پەلەتری بوو کە بیکاتەوە ، بەلاَم هەروا پیا ڕانەگەیشت، چونکە نەئەبوو تا پەڕۆ خوێناوییەکەی ئەشواو ئاوی سەتڵەکە ئەڕێژێتە کونی ئاوە ڕۆکەوە دەرگاکە بکاتەوە

کە ڕوانی خورشەیە دواکەوتنەکەشی کەوتەوە بیر هەتا توانی هەردوو دەستی بەرز کردەوە بیدا بەسەریا بەلاَم زریکەی ئاساو و (( وای باوکە مردم )) و خۆ هاویشتنە ژورەوەی لەگەڵ تەوژمی ئەو ترس و ئازارەی بە باوەش لە چاوە ڕەشەکانی هەڵئەقوڵا گوڵنازیان لای لاشیپانی دەرگاکەوە کرد بە جلی هەڵواسرا و خورشە خۆیدا بەسەر تەختی دالأنەکەدا ووتی : دەرگاکە داخە بە قوربانت بم ، ئەوە لاشەیەکە لەبەر دەرگاکەمان ، دایخە بە قوربانت بم هەر ئێستە پۆلیس یەت ئێمەش قوڕ ئەکرێ بە سەرمانا (( لاشەیەك وا لە بەر دەرگاکەمان )) ئەم قسەیە هۆش و هەستی گیانی هێنایەوە بەر گوڵناز ، لە باتی دەرگا داخستن ، گورج چرای دالأنەکەی کوژاندەوە و سەرێکی کێشایە دەرێ ، کە دی هیچ کەس دیار نی یە (( گەڕایەوە سەر خورشە بە شپرزەیی پرسی : چۆن لاشەیەك ، زیندوو ؟ مردوو ؟ کوا ؟ لە کوێیە ؟ هیچ دیار نی یە ، ئەوەتە لە قوژبنەکەدا ، ئۆی خۆ شوکر زیندووە گوێت لێ نیە ئەناڵێنێ ، دایکی مرێ بە عاستەم نوورزەی دێ وای کوێرابیم دایێ ، ئێجا چی بکەین

- چی ئەکەین ؟ خوا سەبەب کاری بە گوللەی وێڵەوە کات ، ئێمە ئەتوانین چی بۆ بکەین ئێستە پۆلیس دێن ئەیبەن
- ئەیبەن بۆ کوێ ، تەواوی ئەکەن و بەجێی دێڵن
- گوڵناز بیکە لە ڕێی خوادا زوو دەرگاکە داخەرەوە پۆلیس وەکو

لاوەش زۆر لەسەرخۆ بەرەنگێکی زەرد هەڵگەڕاوو دەنگێکی گڕی لەرزۆك وتی :

- جاریٚ تۆ دانیشە کاکی خۆم ، پشوویەك بدە ، نان ئەخۆین و خۆت بشۆو بنوو ئینجا

جوامێر بە تووڕەیی سەری قسەکەی لەدەم سەند و وتی :

- پشووی چی‌و نان خواردنی چی و نووستنی چی ؟ من بۆ ئەم شتانە نەهاتوومە ئێرە ، من هیوام ئەوێ هیوای کوڕم ، ئەمەوێ بیبینم ، ئەمەوێ بیگرمە باوەش تێر تێر ماچی کەم. لە پڕ دەنگ کپ بوو ، گریان گەرووی گرت ، وەکوو بپاڕێتەوە وتی : گیانەکەم کاکە لاوە ! مەی کە بە گاڵتە دڵم ئەوەندەی تاڵە دەزوویەکی قرچۆکی پێوە ماوە بەرگەی ئەم چەشنە گاڵتانە ناگرم وا دیارە دنیاش وێران بیٚ تۆ هەر لەسەر گاڵتەو گەپی خۆتی ! کوان منالەکانم ، بانگیان کە لە خەو لە خواردن ، لە هەموو شتێکی کەی دنیا تاسەی ئەوان، بیری ئەوان و حەز بە دیتنی ئەوان ئەکەم. لاوە هەرچەندە ئەم هێرشە ناکاوەی جوامێر دڵی گووشی بەلام خۆی گرت و لەسەرخۆ پیٚی وت :

- گیانەکەم وا دیارە باش لە قسەکەم نەگەیشتی ، یان ڕاستی‌یەکەی من باشم تێ‌نەگەیاندی ، مەسەلەی گاڵتەو گەپ نی‌یە هیواو دایکی ئێستا لێرە نین بۆیەم ئەم هێنانە لات .

- ئەی لە کوێن ؟ چوون بۆ ماڵی کیٚ ؟ بنێرە بە دوویانا

- لە مانگ زیاترە چوونەتە دیٚی گولان بۆ ماڵی پوورت

.

جوامێر قیژانی ووتی :

- ئەی ئێستە چار چی‌یە ؟ کەواتە نایانبینم ؟

- چار هەر ئەوەیە ئێستە وەکو پێم وتی وابکەیت ، نانیٚ بخۆین و بچی خۆت بشۆیت و بنوویت و بەیانیش یەکیٚ ئەنێرین بە دوویانا .

- ئەبوو پیٚ یان بڵی‌ی کە ئەوەندە بەنگ ئەبن بە تایبەتی کە ئەتزانی من ئەم مانگە زیندانیەکەم ئەبڕێتەوە ! هەرچی چۆنیٚ بیٚ ئێستە چار نی‌یە ئەبیٚ ڕاوەستم تا بەیانی ، بەلام بەیانی خۆم ئەچم بە دوویانا .

لاوە وەکوو شتیٚ ماتەمینی‌یەك دای گرت ، دوای ئێستێکی باش وتی :

- من هیچ بە باشی نازانم کە تۆ خۆت بچی بە دوویانا ، دنیاکەی ناخوران و بخورانە ، تۆش هەمووی دوو ڕۆژە لە بەندیخانە ڕزگارت بووە ، خوا نەکردە تووشی چورتەیٚ ببی لەوانەیە ئەمجارە بەسەرەوە تیا بچیت !

جوامێر تۆزیٚ بیٚ دەنگ بوو ئینجا سەرێکی ڕاوەشان وتی :

- ڕاست ئەکەی خۆ من ناشبیٚ بە بیٚ ئاگادار کردنی دایەرەی ئاسایش لە شوێنی خۆم بجوڵێم ، جا خوا ئەزانیٚ ئەوان ئیزنم ئەدەن یان نە ! .. باشە خێری پێوە بیٚ ، چار نی‌یە ، تۆ یەکێك بنێرە بەلام بەزوویی بزانە ناکرێت هەر لە ئێستەوە بکەوێتە مشوور خواردنی ، بەشکو شەوەکی بکەوێتە ڕیٚ .

- ئەی گیانەکەم پێم ئەووتی بەشەو چوونە دەرەوە قەدەغەیە !

گازینۆو چایخانە نی‌یە و کەسم پیٚ نادۆزرێتەوە . جگە لەوەی بەیانیش بەر لە سەعات شەش کەس ناتوانیٚ بێتە دەریٚ .

- ڕاست ئەکەی کاکە لاوە قسەی تۆیە ، لێم ببورە بە ڕاستی تاسە و بیری هیوا وا سەری لیٚ تێکداوم ئاگام لە هیچ شتیٚ نەماوە . بەلام گیانەکەمی بەیانی زوو یەکێکی باشیان بنێرە بە دوودا . بابە ، چەند پارەی ویست تۆ دوو ئەوەندەی بدەریٚ من ئەتدەمەوە هەر ئەو پیاوەتی‌یەمان لەگەڵ بکا زوو بچیٚ و زوو بیان هێنێتەوە ، پیٚیان بڵیٚ لە ڕێگا هیچ بەنگ ئەبن

- پارەی چی کاکە ؟ شەرم ناکەی ناوی پارە ئەبەیت ! جاریٚ ئەم ئیشە هەموو یەکدوو دیناری تیٚ ئەچیٚ کە هیچ کەماڵێکی نی‌یە، جگە لەوە ئێمە مانان ئەگەر هەزار دینارتان بۆ سەرف بکەین لە

---

واشە ئەسوڕێنەوە ،، تۆقینەکەی خورشە ئەختیٚ سڵەمانیەوە (( چۆن لەبەر ماڵەکەیان ئیشتمانییەکی بریندار گیانی دەرئەچیٚ و ئەم ئەچیٚ قومیٚ ئاوی بکات بە دەمەوە ئەی گوایە زۆراب و ئەم جیاوازی‌یان لە چی دایە پۆلیس دیٚ بەسەرا ئەیگرن چونکە ئاوی کردووە بە دەمی بریندارێکەوە ، یان زامەکەی بۆپێچاوە ؟ کەواتە حکومەت ئەیەویٚ ڕێگەی بەزەیی و هەستی مرۆڤایەتیش لەم خەڵکە بگریٚ و ئەبیٚ ئیتر هەموو کەس بچێتە پێستی گورگ و بەرازەوە ، دەك داوەشیٚ ئەوەی ئەمە قبولٚ ئەکات

- وەرە کچیٚ وەرەبا چارەیەکی بکەین ، خۆ ئیشەڵلا هەروا بە دیارمەوە ڕاناوەستین شیوەنی بۆ بکەین ،تۆ زوو بچۆ پەرداخیٚ ئاو بێنە ، دەی چیتە ئەوە کچیٚ بۆناجوڵێیتەوە ؟ زووکە،زوو با ئەیەم بە تیتك ڕاتکێشم هەستە دەی درەنگە .

هەروا چوار پێنج هەنگاویٚ لەولای دەرگاکەیانەوە لە قوژبنێکدا زامارەکە وەك ژیشك خۆی هێنابوەوە یەك ، کە گوڵناز دەستی برد سەری بەرز کاتەوە توند دەستی گرت ووتی ئەوەکی‌یە ؟

بەرلەوەی گوڵناز بێتە قسە ، دەستی وەرامی دابووەوە، بۆیە گورج بەرەڵای کردو ووتی : دەستم داوێنتان بم بەنە پەنایەکەوە با لەویٚ گیانم دەرچیٚ ، لێرە بمدۆزنەوە لەژێر پۆستاڵدا ئەم کوژن حەز ئەکەم هەر بەم گولانە بمرم! کە دی هیچ ورتەیان ئەبوو ، بە دەنگێکی گڕی لەرزۆکی پڕ ئازاری گلەییاویی ووتی :

- درەنگە زووکەن ئەتوانن بم بەنە شوێنێك بم بەن ، ناتوانن خێرا کەن برۆن با ئێوەش تووش ئەبن ، بتان بینن بە هاوڕیٚ‌ی منتان ئەزانن ئەتان گرن ، گوڵناز بڕیاری خۆی دابوو ، ئەگەرچی‌لەرەی دەنگ و گیانی دڵسۆزیی و مەردایەتی قسەکانی هەرچی هەستی بەرز و ئینسانی هەیە لە دڵیا هێنابوویە جۆش ڵی‌ی تێکچوو بوو ئەو زامارەی بەردەمی ئەریمانی کوڕەتی یا یەکێکی تر ، لەکاتێکا کە ئاوی ئەکرد بە دەمیەوە ، بە دەنگێکی ئەدارەوە ووتی :

- بە قوربانی برینەکەت ئەبم چۆن لێرە بە جێت بەلم ، ئادەی خورشە ئامەردت ئەکەن بۆ وا حەپەساوی ؟ دەستی بەریٚ لە گەڵم ،، هەر چۆنیٚ بوو بریندارەکەیان هێنایە ماڵەوە ، هەر بە ڕێگاوە تەگبیری ئەوەیان

کرد کە یەکسەر بیبەنە ژێر خانەکەی خورشە چونکە چەپەکەو ڕێگەی کەسی بەسەرەوە نی‌یە ویستیان لەسەر دۆشەکێك پاڵیخەن رازی ئەبوو ، پشتی‌یەکیان خستە پاڵی . قومیٚ ئاویان دایێ ویستیان تەماشای زامەکانی بکەن خەریك بوو شەرم بکاو ئەهێڵیٚ ، گوڵناز ووتی :

- کوڕی خۆم ئێمە دایك و خوشکی تۆین شەرمی چیمان لیٚ‌ئەکەی ؟ لێم گەڕیٚ با جاریٚ تەماشای زامەکانت بکەم دوو گوللەی پێوە بوو ، یەکێکیان سەر شانی گرتبوو بەر ئێسقانی نەکەوتبوو ، بەلام ئەوی‌کەیان دابووی لە قاچی ، گوڵناز لای وابوو کە بەر ئێسقانی کەوتووە جگەلەوەی‌خوێنێکی زۆری لیٚ ڕۆیی بوو وادیار بوو زیاتری ئەوە پەکی خستبوو ، گوڵناز کەوتە تیمارکردنێکی سەرەتایی برینەکانی وەکوو لە کتێبیا خوێندبوویەوە یان بیستبووی ، بە خورشەشی ووت کە هەستیٚ زوو سەتڵێك ئاوو پارچە پەڕۆو بنیسکیٚ سابون بەریٚ و هەموو چراکانیش داگیرسێنیٚ و لە دەرگای حەوشەوە بە ووردی پیا بێت ، هەر دڵۆپە خوێنێکی دی بیسڕیٚ و شوێنەکەی پاکاتەوە ، خۆشی هەر کە لەفرمانە بە ئەرکەکەی بووەوە، چوو بەلای خورشەوە ئەوەك باش بۆ پەڵەکان ئەگەڕیٚ کە گەڕانەوە ژوورەکە ڕوانیان وا کوڕە لەسەر دۆشەکەکە پاڵی لیٚ داوەتەوە و چاوی لێکناوە جاروبار ناوچەوانی گرژ ئەکات و لێوی ئەکرۆژیٚ ، گوڵنازیش بە بیٚ دەنگی پەلی خورشەی گرت کە خەریك بوو دەست بکا بە گریان ، هێنایە دەرەوە و بە ئەسپایی دەرگاکەی لەسەر کوڕە پێوە دایەوە کە هاتە ژووری دانیشتنی خۆیان بە خورشەی ووت :

- وەرە دانیشە بەرامبەرم

خورشە وای زانی ئەیەویٚ لە هۆی دواکەوتنەکەی بتۆژێتەوە ، خەریك بوو بکەوێتە قسە ، گوڵناز پی‌ی ووت :

– تۆ جاریٚ ڕاوەستە بزانە من چی ئەڵێم ئنجا گەروتم بۆ پاك بکەرەوە ،

چاکەتان دەرناچین، ئێوە لە ڕێگای نیشتمانا دەستتان لە ژیان هەڵگرتووە ، زیندانتان دیوە ، ساڵەهای ساڵە لە ماڵ و منـــــاڵی خۆتـــــان دوورخراونەتەوە ، لە خۆشی و ئـازادی بێبـەش کـراون ، ئێـــوە ســـەری ئێمـــەتان بەرزکردۆتەوە . جگە لەمە تۆ ئـامۆزامی ، بـڕ بڕەمـی مـن پارەم بۆکێیە بۆ تۆ نەبێ .

جوامێر بە تەریقی‌یەکەوە وتی :

- باشـە بابـە تـۆ خـۆت چۆنی بە باش ئەزانی وا بکە سوپاس !

لاوە بەزەردەخەنەیـــەکی پـــڕ بەزەیی‌یەوە وتی :

- کەواتـە بـا جـاریّ بچـم بزانم شیوەکەیان بۆ ئامـادە کردووین ؟ من زۆرم برسی‌یە بێ گومان تۆش .

ئـەوەندەی پـێ نـەچوو لاوە گەڕایـــەوە لای جوامـێر ، بـــە نەحتیّ تەریقی‌یەوە پیّی وت :

- داخم ناچێ شیوەکەمان ڕووی مەجلیســی نی‌یـــە ، هـەروا نـەختێ چێشـتی نیوەڕۆمان ماوە ، بۆیـە پێـم ووتـن هێلکەو ڕۆنێکیشـمان بـۆ بکـەن و لـە ژوورەکـەی خۆشیان بۆمان دانێن لەویّ ئـەی خۆیــن. منالّــەکانیش لەوێن ، حەز ئەکەن چاویان پێــت بکـــەویّ. ووشـــەی منالّەکان جوامێری وەك کەو چـــووان بۆیـــە پـــاش بـــێ دەنگی‌یەکی زۆر ئینجا بیری کەوتەوە کەنەبێ قسەیە بکا ئەوسا ووتی :

- هێلکـــەو ڕۆنـــی پـــێ نەئەویســـت ئـــەوی هـــەبوو بەس بوو ، خۆت ئەزانی من لـە خۆمـا ئـەوەندە چلێـس نـــەبووم ، لـــە زیندانیشـــا ئەوەندە ماشە سپی و پیاز و چێشتی شـێلم وماشـێنیان داوینیّ هـەموو خواردنێکی کەم لەلا فرنی فالۆزەیە !

کە چـوون بـۆ شـیو کـردن ، دوو ئافرەت و چوار منالّ لە ژوورەوە بـوون ژنـەکان کـەوا دیـار بـوو خۆیان بۆ بـەخێرهاتنی جوامـێر ئامادە کردبوو ، بەرزەپیّ لەبەری هەسـتان ، خێزانەکـەی لاوە بـە دەنگێکـــی دلّـــێر و دەمێکـــی پاراوەوە و ئافرەتەکەی کەشیان بـــە دەنگێکـــی شـــەرماوی بەخێرهاتنی (( کاکـە جوامـێر )) یـان کـرد. چـوار منالّەکـەش ، یەکێکیان شیرە خۆرە بوو لە ناو بێشکەدا پالّ خرا بوو گڕوگالّی ئەکرد لەگـەلّ دوو کچـی هەشـت نـۆ سـالآن ، منـالّی چوارەمیـش ئـەوکوڕە بـوو ، کـە جوامـێر لـە کاتی دەرگا کردنەوەدا بە هیوای کوڕی تیّگەیی بوو . ئەویش بە دوو دلّی و تەریقی‌یەوە لە مامـە جوامێر چووە پێشەوە پڕی کرد بـە دەسـتیا مـاچی کـرد و خـێرا گەڕایـەوە لای دایکی و پـووری ، کەوا بێ دەنگ دوور لەو مێزەی لاوەو جوامێر لەبەری دانیشتن بۆ نـــان خـــواردن، لـــە دەوری ســـــەماوەرە زەردەکـــــەیان دانیشتبوون ، یەکێکیان فووی لە ســـــەماوەرەکە ئـــــەکرد و ئەویکەشـیان پیالّـەی لەســـەر سینی ڕیز ئەکرد.

لاوە یەکەیەکـە نـاوی منالّـەکانی خۆی بە جوامێر ووت ، ئینجا بە گالّتەوە پیّی ووت :

- خـــۆ پێویســـت ناکـــا نازداری خێزانیشم و بەهیّی ژن خوشـکمت پـێ بناسـێنم !؟

جوامێر کە ناوی بەهیّی بیست وەکـو شـتێ تـاس بردی‌یـەوە ، چۆن ئەو ژنە چاو کوتـو کوێـرە ڕەقەلّـە پێسـت بـە ئێسـکەوە نووسـاوە ئـەو بـەهیّ شـۆخ و شەنگە ڕوومـەت پـەڕەی گولّەیـە کە پاش دە سـالّ شـووکردنیش لە جوانەکانی شار ئەژمێردرا !

جوامـێر خـۆی پـێ نـەگیرا بەئەسپایی لەلاوەی پرسی :

- ئـەریّ بـە ڕاسـت ئـەوە بەهیّ بۆچی وای لیّهاتووە ؟

لاوە بەسەر بادانێکەوە ووتی :

- ئەگـەر بێعـار نەبووایـە ئەوەشی نەئـەما ! جاریّ با نانەکـەمان بخۆیـن ئەوسـا باسـەکەیت بـۆ ئەگێڕمـەوە ، نامـەویّ لـە ئیسـتەوە دلّـت بگـــرم ، کـــە چوویتـــە ژوورەکـــەی خـــۆت لـــەویّ بەسـەر پێـوە باسـی بـەهیّ شـت بـۆ ئەگێڕمەوە چونکـە وادیـارە مـاندوویت خـەوت دیّ ، جگـە لـەوەش ئـەلّێی پێش نووستن خۆم ئەشۆم .

ماوەیەتی

---

ئیسـتە کـاتی باسـی لـە بەیانیـەوە هەلّگیرانی تۆ نییە ، با بیرێك لە حالّی خۆمـــان بکەینـــەوە و مشـــوورێکی ئەمشەوی ئەم بریندارە بخۆین گیانمان بەوەیە باوکی ئەریمان ئێوارە نایەتـەوە مالّیّ بۆ نان خواردن خورشە هەلّی دایی‌و ووتی :

- جا ئەو نادی بۆ خۆش بیّ کەی مالّی هاتووە بە بیرا وای لەم پیاوە چۆن دلّو دەروونێکی هەیـە وەرە ڕۆژێکـی وا کە خوێن ئەباریّ تۆ سەرێك ئەکێشیتە مالّەکەت بزانی ماوین ، مردووین ، بەو خوایە گولّنـاز خـان ئـەبیّ تـۆ حـەوت پەراسووت لە ئۆمەتی موحەمـەد زیـاتر بیّ کەوا ئەم هەموو سالّە لەگەلّ ئەم بیّ باکەی کەمتەرخەمە هەلّتکردووە ؟

گولّناز بە زەردەخەنەیەکی تفتەوە ووتی :

- تـۆ جـاریّ لـەوەش گـەڕیّ و ئەوەندەش سپلّە مەبـە ، ئەوەتـەی هەیە ئیمڕۆ ئەهاتنەوەکەی چاکیی تیـا بـووە کـەچی تـۆش گلـەیی لیّ ئەکـەیت ؟ هەسـتەو چاویشـت ئـەفریّ بەوخوایـە کەمـە ئیسـتـەو زوو یەتـەوە چونکە هاو پیالّـەکانی خـەریکی پـاك کردنـەوەی دەستە خوێناویـەکانی خۆیـانن مـەعلوم ئەمشـەویش کۆمـەلّیّ خـەلّکی بـێ تاوانی تر ئەگرن بـە نـاوی ئـاژاوە نانەوەوە ، ئیستە ئێمە چی بکەین چاکە ؟ خوورشە ووتی :

- دایکی‌بمـــریّ گوللەکـــە قـــاچی هەلّتەکاندووە جەرگ و دلّی ئەوانە هەلّتـەکیّ کە وایان لێکرد تۆ بلّـیّی نـەمریّ؟ گولّنـاز بـەدەم بیرکردنەوەوە ووتی :

- نەءبڕواناکەم بمریّ بەلاّم چی لیّبکـــەین کیّشـــکاوییەکەی بگرێتەوە ؟ چۆن برینەکـەی تیمـار کـریّ ؟ ئـەو برژاندنـــەوە و پێچانـەی ئێمـە تـەنیا بـە کـەلّکی ئەمشـەو بێـت زۆر چاکـە ، خـۆ خوانـەکردە ئەگـەر خوێنـی بـەر بێتەوە ئەوە جارێکی تر چاو بە دنیـادا نـاگێڕیّ ، دایکەکـەی کوێـر بیّ هەر لـە تەمـەنی ئـەریمان دایـە

- وای کەبە غیرەتە بەو هـەموو زام و ئـازارەوە هـاواری نـەکرد بەسـەزمانە هـە ڕلێـوی خـۆی ئەکرۆشـت ، بـۆ بەدبـەختی ئاشزانین کوڕی کێیـە خەبـەر بـە کەسو کاری بدەین ؟

گولّناز بە ئارامی‌یەوە ووتی:

- وای لـەو عەقلّە ، کچم ئـەوەی تـۆ باسی ئەکەی کاری سبەینیّمانە ، تـۆ جـاریّ پێـم بلّـێ چـاری ئەمشـەومان چییـە ؟ ئـەوە ئاغـا دلّپاکە نیشتمان پەروەرەکەت زانی ؟ خـۆ لـە پێش منـا سـەری تـۆ ئەتاشی‌و سواری کەرت ئەکات هـەر ئەمشـەومان بـێ موقـەدەر لیّ بڕۆیشتایە ئیتر بەیانی خوا یار بیّ ئەیگەێنمە ناو کەس و کاری خۆی ئەگەر ئاگر باریبووە .

خورشـە هەرچـەند سـەری ئـەهێناو سـەری‌ئەبرد ئـەی ئـەزانی چارە بۆچـی بدۆزێتـەوە بریـنـدارە وا نووســتووە ، ئاغـاش دێتـەوە سـەرخۆش لا لا مـو ئەکات ئەگەر ئەم دەرگایەی بۆ بکاتەوە دەستیّ درێژ ئەکا بۆ سنگ و مەمکی و ئەم وەکـو کـار ئاسك بـۆی دەرئـەچیّ و ئەویش ملی ڕێگـە ئـەگریّ و ئەچێتـەوە لای گولـزار خـان ئیـتر ئەمـە چـارەی بۆچی‌یە ، بـەلاّم خـۆ ئەگـەر خوانـەکردە بریندارەکـە ئـازاری زۆری بـۆ هێنـا هاواری کرد ئیتر ئەوە چارەی بە ئێمـە نـاکریّ ئـەبیّ خۆمـان و ئـەو و هـەموو کارەکە بدەینە دەست خوا خۆی چیمان لیّ ئـەکات بیکـات ، هـەمووی بـە دەسـت خۆیەتی ئەگەر بیەویّ هەروەکو تووشی کردوین چارەشمان ئەکات!

گولـزار نەیهێشـت خورشـە لەسـەر خەیالّی خۆی بڕوات ووتی:

- چیتە ئەوە ؟ئێسکت خواتەوە ، بە ئاخێرت من تۆم هێنا تەگبیرت پێ بکەم کەچی وەکوو بت بەرامبەرم دانیشتووی ، ئـەوە بـۆ گۆرانـی و چەپلّە لێدان بوایە خێرا بوویت (( ئاووس یـالّلا خـێر )) خوایـە بمـان پارێزی ، کچیّ هەستە تـۆ بچۆرە ژوورەکـەی خـۆت دەرگاکـەی خـڕو چراکە بکوژێنەوە و خۆت بکـە بـە ژێـر جێگاکەتـەوە ئەگـەر هـەوالّی پرسیت ئـەلّێم ئەخۆشـە ، ترسـاوە هەر لە ئێوارەوە نووستوە ، هەستە دەی وا منیش ئـەچم دەرگاکـەی لیّ ئەکەمەوە کچیّ ئاگات لە خۆت بیّ بەئەسـپایی بجولّێرەوە هـا کوڕەکە هەلّئەستێنیّ!!.

ماوەیەتی

خانووه کۆنەکەی (ئیبراهیم ئەحمەد) لەگەڕەکی دەرگەزێن، کە ئێستا هۆڵی (زامواْ)یە





ئیبراهیم ئەحمەدو گەلاوێژخانی هاوسەری - ٣/٤/١٩٥٦

# چۆن زمانەکەمان بنووسین[1]

لە نووسینی ئەم وتارەدا وەکوو ئەبینن هیچ جۆرە نیشارەتێکم بەکار نەهێناوە کەوا لەم یەك دووساڵەی دواییەدا جاروبار لە نووسینی کوردیدا بەکار دەهێنرێن . نیازیشم لەمەش دوو شتە : یەکەم نامەوێ پێشەکی دەری بڕم کە لەم جۆرە نوسینانە کامیان پەسەند ئەکەم . دووەم : لام وایە زۆربەی خوێندەواری ئێستە ئەم نووسینە ساکارە باش ئەخوێننەوە .

سەرەتا : لام وایە تێکڕا لەو ڕۆژەوە کە زمانی کوردی خراوەتە سەر کاغەز بە تایبەتی لە پەنجا ساڵی ڕابوردودا هیچ خوێندەوار وە نووسەرێکی کورد نیە ئەم پرسیارە جێگایەکی لە مێشکی وەبە شێکی لە ژیانی داگیر نەکردبێ . لەگەڵ ئەمەشدا ساڵ بە دوای ساڵدا ڕا ئەکات وە ژیانی بێ وەرام مانەوەی ئەم پرسیارە پەرە ئەسێنێ بە بێ ئەوەی زاناو تێگەیشتوان گەلە کۆمەکیەك بکەن بۆ نەهێشتنی وە بۆ دۆزینەوە و دانانی ڕێگەیەکی باو وەباش وە بەجێ بۆ نووسینی زمانەکەمان تاکو لەم پاشاگەردانی نووسینە ڕزگارمان ببێ کەوا سەری لە هەمووان شێواندووە وە ڕێگەی پێشکەوتن و یەکگرتنی لە زمانەکەمان بردۆتە بەست .

ئەڵێم گەلە کۆمەکی چونکە ئەو تەقەلایە کتەنیانەی تا ئێستە دراون ، ئەگەر چی کەس ناتوانێ بڵێ هەر بە تەواوی بێ سوود بوون بەڵام لەگەڵ ئەو سوودەشدا کە بوبێتیان تا ئەندازەیەك مایەی سەر لێ شێواندنەکەیان زیاتر وە ماوەی یەك نەگرتنەکەیان فراوانتر کردووە چونکە خاوەنی ئەم تەقەلایە یەکتەنیانە هەر وەکو نەیان توانیوە لە ڕێگەی گفتو گۆ کردن وە نووسینەوە بیرەکەی خۆیان بەخەڵك بسەلمێنن : دەسەڵاتی ئەوەشیان نەبووە کە بە زۆر بەسەریاندا بسەپێنن . بۆیە هەر کەسە بە ئارەزووی خۆی چۆنی ویستووە نووسینی خۆی وانووسیووە تاوای لێ هاتووە ئەتوانرێ بگوترێ هیچ دوو کەس نی یە کە وەکوو یەك بنووسن . جا لە گێژی ئەم پاشا گەردانیەدا خوێنەرەوەی داماویش سەری لێ تێکچووە نازانێ کام جۆرەیان ڕاستن وە کامیان چەوت ، وە کێیان پەیڕەوی باشە . بۆ ئەوەی ڕەخنەگرتنەکەم لەزاناو تێگەیشتوانی کورد لە ڕاستی لادانی تیا نەبێ پێویستە دان بەوەدا بنێم کە بەستنی کۆبوونەوە ( کونفراس ) ێك کە تاقە ڕێگایە بۆ پیکهێنانی ئەم گەلە کۆمەکیە زۆر کۆسپی لە ڕێدا بووە و هەیە . بەڵام ئەم پێ لێنانەم گوناهەکەیان کەمیش کاتەوە بە یەکجاری لای نابات چونکە باوەڕ ناکەم کەس هەبێ بتوانی بڵێ ئۆباڵی ڕاستەوخۆی نەهێنانە پێشەوە و لێ نەدوانی ئەم مەسەلەیە وە تەقەلا نەدان بۆ لابردنی ئەو کۆسپانە وە بۆ بەستنی ئەم کۆبوونەوەیە ناچێتە ئەستۆی زاناو تێگەیشتوان بە تایبەتی وە هی هەموو خوێندەوارانی کورد بە گشتی . لەگەڵ ئەمەشدا ئێستەش ئەچووە بچێ تەنیا ئەوەندە هەیە کە ئەبێ دواکەوتنمان لە پێك هێنانی ئەم فرمانەدا هەتا ئێستا پتر هانمان بدات بۆ ئەوەی تەقەلا بدەین کە زۆرتر و باشتر جێ بەجێ ی بکەین .[1] بەڵام ڕەنگە لەبەرئەوەی بەستنی ئەم کۆنفراسە وا بە زوویی لە وزەدا نەبێ پێویستە هەتاکو پێکدەهێنرێت وە لە ڕێگای تێکۆشیندا بۆ پێك هێنانی دەستە پارچە نەوەستین بەرامبەر بەم پاشا گەردانی نووسینە چونکە وەك دەردی گران وایە تاڵێ ڕاوەستین زیاتر لێمانی پیس ئەکا . بۆیە پێویستە هەر چۆنێك بووە کارێکی وا بکەین کە بەری بگرێ . چاکترین کار کە پێویستە بکرێ لەم ماوەیەدا بەلای منەوە ئەوەیە کە ئەو چەند گۆڤار و ڕۆژنامە کەمەی کوردی کە هەن هەریەکە بەشێك لە لاپەرەکانیان تەرخان بکەن بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم ناگزوریە وە خوێندەواران و زانا تێ گەیشتوان زمان ناسانیش بە کوڵ بە دڵ و گیانێکی پاکی عالمانەوە هاوکاری بکەن لە لێکۆڵینەوە و دەرخستنی دیوی دەروونی ئا گزووریەکەدا تاوەکو لە ئەنجامدا دوای شەن و کەوکردن و بەراورد و بژارکردن وە وردبوونەوەی مەسەلەکە بتوانرێ بیرێکی پوخت لە بارەیەوە بە گەڵاڵە کراوی بخرێتە بەردەم ئەندامانی ئەو کۆنفراسەی ئەبەسترێ خۆئەگەر هاتوو، خوا نەکردە! نەش بەسترا ئەوا دیسان ئەو بیرە پوختە گەڵاڵە کراوەی کە زۆربەی زاناو تێگەیشتوان و خوێندەواران ڕەئیان تیایابووە وە پەسەندیان کردووە . وە بەشی هەرە زۆری چاکی هەموو ئەو دەستووری نووسینانەی تیا ئەبێ کە تا ئێستە هەن وە بەشی هەرە زۆری خراپیەکانیانی لێ دوور ئەخرێتەوە ئەتوانرێ ئەمە بکرێ بە دەستووری نووسین بۆ زمانەکەمان وە بەم چەشنە بە هاوکاری هەمووان با دووریە دووریش بێ ئەتوانین دەستوورێکی یەك جۆری نووسین بدۆزینەوە کە تا ئەندازەیەکی زۆر زمانەکەمانی بە ئاسانی پێ بنووسرێ وە بە ڕەوانی پێ بخوێنرێتەوە . جا لەم کایەیەشدا گۆڤاری هیوا بە سایەی لە بارابوونی پترو توانای زیاتریەوە پێ ی ئەکرێ گەورەترین و باشترین مەیدان پێشکەش خوێندەواران و[2] زانایان بکات وە ئەشتوانێ ڕەئی کوردی ئاسانی بێگانەش وەرگرێ بۆ چارەکردنی ئەم ناگزوریەی گشت هاوارمانە لە دەستی . بەڵام چەپڵە بە دەستێ لێ نادرێ و ئیش تەنیا بەمەیدان پێشکەش کردن و لاپەڕە تەرخان کردنی گۆڤارەکان پێك نایەت وەکو لە پێشەوە وتم هاوکاری بە کوڵ و بەدڵ و تێکۆشینی دڵسۆزانەی هەموو خۆێندەوار و زانا و تێگەیشتوانی کوردی گەرەکە ئەگەر بیانەوێ زمانەکەمان لەم قۆرتە ڕێگا ڕزگار بکەین . ئەگینا ئەم هەلەش کە داوا ئەکەم گۆڤاری هیوا بۆمانی هەڵخات وەکو ئەو هەلەی لێ دێ کە ( گەلاوێژ ) هەڵی خستبوو کاتێ لە پێشکەش کردنی ژمارەیەکیا نووسیبووی یەکێ لەو قۆرتە گەورانەی دێتە ڕێ ی نوسیاری چەشنی نووسینی املا یەوە ئەمە بە ڕاستی شایانی سەر شۆڕی و تەریق بوونەوەیە کە هێشتا چەشنێك نووسینی تایبەتی یە کە زمانی کوردی پێ بنووسرێ . لەم ژمارەیەی گەلاوێژدا ئەوەندە گوێم نەدایە ئەم قۆرتە ، هەر نووسەرە خۆی چۆنی نوسیبێ هەروا لە چاپ درا .

ئەمە مانای ئەوە نی یە کە گەلاوێژ ئەیەوێ ئەم حاڵە بەم پشێویە بمێنێتەوە . بە پێچەوانە یەکێ لە نیازەکانی گەلاێژ ئەوەیە کە ماوەی تێگەیشتوان و پێگەیشتووە زاناکانی کوردبدات کە لەم بابەتەوە بیری خۆیان بنووسن بەشکو لەم پاشا گەردانی نووسینە ڕزگارمان ببێ کانونی یەکەمی ١٩٣٩ کەچی بە درێژایی ژیانی گەلاوێژ ئەمان دی ئەو پێگەیشتووە تێگەیشتوانەی هاواری بۆ بردوون هاوکاریەمی بکەن و دەستێکی بگرن لە چارەکردنی ئەم قۆرتەدا کە ماوەی بۆ تەرخان کردبوون لە لاپەڕەکانیا . جا لێرەدا ئاواتم ئەوەیە کە ( هیوا ) لە ( گەلاوێژ ) بەختیار تربێ هەرکەسە بە کوڵ و بە دڵ تر بەپێ ی توانا لە یاریە دانی درێغی نەکات تا بتوانێ بە فەرمانی خۆی هەستێ وە بە پشتیوانی هەموان نیازەکانی خۆی بە جێ بهێنێت و ئاواتە کانی ( گەلاوێژ ) یش بهێنێتە دی .

## چاکترین ئەلف و بێ

لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگە کەم گەل هەبێ لە دنیادا لە دەستووری نووسینی زمانەکەی خۆی بێ گلەیی بێ کەچی لە توانای هیچ کامێکیاندا نی یە کە ئەو گلەییانە نەهێڵێت بۆیە مێشکی خۆیان بەوەوە خەریك ناکەن

که چاکترین چەشنە ئەلف و بێ بۆ نووسینی زمانەکەیان بدۆزنەوە.[2] بەڵام گەلی کورد لە رووی دواکەوتوویی و نەبوونی سەروەت و سامانێکی ئەوتۆی نووسراوی ئەدەبی و عیلمیەوە نەك هەر ئەتوانێ بەوپەڕی سەربەستیەوە بیر لەم مەسەلەیە بکاتەوە . بگرە زۆر پێویستە لەسەر زاناو تێگەیشتوانی کورد بەم نیازو ئامانجەشەوە خەریکی چارەکردنی مەسەلەکە ببێ . بە بێ ئەوەی خۆیان ببەستن بە هیچ جۆرە ئەلف و بێ و چەشن و شێوەیەکی تایبەتی نووسینەوە . بە گیانێکی عالمانەوە سەربەست بگەڕێن بۆ چاکترین چەشن و ئەلفو بێ ، کە ئەڵێم چاکترین ئەلفو بێ‌یەکی تایبەتی نی‌یە مراز هەر ئەلفو بێ یەکە کەوا چەند پێ ناسەرەوەیەکی تایبەتی هەبێ کە ئەمانەی لای خواروو هەندێکیانن . هەموو ئەو دەنگانەی لە دەمی قسە پێ کەرانی زمانەکە دێتە دەرێ بە ئاسانی پێی بخرێتە سەر کاغەز ( شتێکی ئاشکرایە کە ئەمە هەموو شێوەکانی زمانەکە خۆی وە گشت ئەو ووشە بێگانانەش ئەگرێتەوە کە لە زمانەکەدا بەکار ئەهێنرێن .

٢- هەموو ئەو دەنگانەی پێی ئەنوسرێ بە ڕەوانی وەکو لە دەمی قسە پێ کەرانی زمانەکە دێتە دەرێ وەها پێی بخوێنرێتەوە ( بەبێ ئەوەی هیچ پێویست بەوە بکات کە خوێنەرەوە پێشەکی ئەو ووشانە بزانێ کە ئەیان خوێنێتەوە ) .

٣- پێ نووسینی کەمترین وەختی بوێ ئەمەش بەوە پێك دێ کەوا

ا شکڵی پیتەکان سادە بن وە کێشەکانیان لەسەر کاغەز سووك بێ .

ب نووسینەکەی پچڕ پچڕ نەبێ دەست لەسەر کاغەز هەڵگرتنی کەم بێ واتە پیتی منفصل وە نوختە و ئیشارەتی نەبێ وەئەگەر بووشی کەم وە سووك وە سادە بن[4]

٤- نووسینەکەی جووان و ڕێك و پێك بێ ناڕێك و ناقۆڵا نەبێ وەکو ( شەڕە پشیلە ) .

٥- هەر دەنگە پیتی تایبەتی و دیاری خۆی هەبێ کە بە ئاسانی بناسرێتەوە بۆ ئەوەی منداڵ و تازە فێربووسەریان لێ تێك نەچێ خۆ ئەگەر پیتەکان ئەو پیتانە بوون کە لە نووسینی ئەو زمانانەدا بەکار ئەهێنرێن کەوا قسە پێ کەرانی زمانەکە ئاشنایەتیان لە گەڵیاندا هەیە ئەوا پێویستە تا ئەتوانرێ هەوڵ بدرێ ئەو دەنگانەی پێیان ئەنووسرێ وەکو ئەودەنگانە بن کە لەو زمانانەدا پیشانی ئەدەین ، ئینجا لەبەر تیشکی ئەوانەی لای ژووروو سەرنجێ بدەین لە نووسینی زمانەکەمان بە هەردوو جۆری نووسینی واتە نووسینی بە پیتی لاتینی وە نووسینی بە پیتی عەرەبی با ئەویش بمێنێتەوە بۆ جارێکی کە .

**زمانەکەمان چۆن بنووسین ؟[5]**
**بە پیتی عەرەبی یا لاتینی ؟**

ڕەنگە هەندێ خوێندەوار بڵێن مەسەلەکە هیچ پێویست بە پرسیار و پرسیار کاری ناکات وەکو مانگ ئاشکرایە کە زمانی کوردی ئەبێ بەپیتی لاتینی بنووسرێ وە پیتی کەم و کورتی عەرەبی بۆنووسینی کوردی دەست نادا وە کوردی پێ نانوسرێ وا ئەزانم ئەو کەسانەی لایان وایە مەسەلەکە هیچ پێویست بە لێکۆڵینەوە ناکات هێشتا بە تەواوی گرانی فرمانەکەیان هەڵنەسەنگاندووە نازانن کاری و[6] هەر بە سەلماندن و تێ گەیشتنی چەند خوێندەوارێ پێك نایەت ــ گینا ئەیان زانی‌کە بۆ جێ‌بەجێ کردنی کارێکی گرنگی وەکو پیتی نووسین و ئەلف و بێ گۆڕین چەند کۆسپی گەورە گەورەیان دێتە ڕێ بە تایبەتی لەناو گەلێکی وەکو کوردا کە هیچ دامەزراوێکی دەسەڵاتداری نیە فرمانەکە بگرێتە ئەستۆ . وە تاقە کوتەکی دەست بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم فرمانەوە هەموو فەرمانێکی کەی گرنگ . گلێر کردنەوە و یەکخستنی زۆرترین ژمارە لە دەووری .

لە ڕێگەی تێ گەیاندن و پێ سەلماندنەوە کە ئەمەش پێکنایەت بە بێ لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و باسکردنێکی فراوانی مەسەلەکە . جگە لەمە ئەو هۆیانەی لایەنگرانی بە پیتی لاتینی نووسین پیشانیان داوە هەتا ئێستە بەشی زۆری لەوە ئەچێ کە بەری لاسایی کردنەوە و خۆ لە ڕۆژئاوا نزیکخستنەوە بن نەك ئەنجامی لێکۆڵینەوە و یەکالا کردنەوەیەکی عیلمی وورد بۆیە ، بە لای منەوە مەسەلەکە پێویستی بە روون کردنەوەیەکی تەواو هەیە لە لایەن زانا و تێگەیشتوانەوە چونکە ئەم روون کردنەوەیە چەکی دەستمان ئەبێ لەو خەباتەدا پێویستە بۆ سە رخستن و جێ‌بەجێ کردنی ئەو بیرەی ڕاستیەکەیمان بۆ دەرئەکەوێت . ئینجا با بێینە سەر باسەکەی خۆمان . لە ژمارەی پێشوودا چەند جیاکەرەوەیەکم باسکردبوو کەوا بوونیان لە ئەلف و بێ‌یەکی باشا پێویستە . دەبا لەبەر تیشکی ئەو جیاکەرەوانە سەرنجێ بدەن لەو هەموو هەر دوو جۆرە پیتەی وان لە گۆڕێ ، واتە پیتی عەرەبی وە پیتی لاتینی بزانین کامیان بۆ کوردی نووسین چاترە . لە ئەنجامی سەرەنجدا ئەکەماندا ئەم ڕاستی‌یانەی لای خوارووومان بۆ دەرئەکەوێ:

١- هەردوو ئەلف و بێکە چ لاتینی چ عەرەبی وەکو هەن ، واتە وەکو لە لاتینی وە عەرەبیدا بەکار ئەهێنرێن زمانی کوردی‌یان نە بە ئاسانی پێ ئەنووسرێ وە بە ڕەوانی پێ ئەخوێندرێتەوە . بەڵام ئەگەر بێتو ئەم پیتانە وەکو کەرەسەیەکی خاو وەرگرین و بە پێی پێویستی زمانەکەمان دەستکاریان بکەین و ناویان لێ بنێین و ئیشارەتیان بۆ دابنێین ئەتوانین بەهەریەکەیان هەموو ئەو دەنگانەی لە دەمی کوردێك دێتە دەرێ بە ئاسانی پێی بخەینە سەر کاغەز لەگەڵ هەموو ئەو ووشە بێگانانەشدا کە لە کوردیدا بە کاریان ئەهێنین . هەروەها ئەتوانین بە ڕەوانیش پێ نوسراو بخوێنینەوە بە بێ ئەوەی پێویست بە پێشەکی زانینی ئەو ووشانە بکات کە نووسراون .

٢- پیتی عەرەبی بە پێی جێگەیان لەوشەدا شکڵیان دەگۆڕێ هەر پیتە چوار شکڵی جیاوازی هەیە : بە تەنیا لە پێش ووشەوە لە ناو وشەدا وە بەدواییەوە ( ئەمە جگە لەو پیتانەی بە پیتی دوای خۆیانەوە نانووسێن وە تەنیا دوو جۆریان هەیە ) ، بەڵام هەرچی وەکو پیتی لاتینیە تەنیا یەك شکڵی هەیە وە بە پێی جێگەی لە ووشەدا شکڵی گۆڕی ( ئەمە جگە لە پیتی گەورە کە لە دەست پێ کردنی جوملە وە ناوی تایبەتی و ئەمانەدا بەکار ئەهێنرێ . جا لەبەر ئەم ئەگۆڕانەی پیتەکان بە پێی جێگەیان لە ووشەدا فێربوونی پیتی لاتینی ئاسانترە لە پیتی عەرەبی وەختی کەمتری ئەوێ وە هەر لەبەر ئەم هۆیەش فێربوونی بۆ چاپکردن و تایپ کردنیش سووك و ئاسانترە.

٣- پیتەکانی لاتینی لەچاو پیتەکانی عەرەبیدا کەمترە لەیەك ئەچێت بۆیەبە ئاسانتر لەیەك جیا ئەکرێتەوە و ئەناسرێتەوە وە باشتر لەمێشکی منداڵدا جێگیر ئەبن .

٤- لە لاتینی دا هەموو پیتەکانی ووشە بەسەریەکەوە ئەنوسرێن وە جگە لە پیتی ( ئای ) و ( جەی ) ی هەمووی بێ نوختەو بێ ئیشارەتن وە خۆمان هەرچی چەندی نیشانەشیان بۆ دابنێین ناگاتە چەند یەکێکی ژمارەی نوختەکانی پیتی عەرەبی لەبەر ئەمانە نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی وەختی کەمتری ئەوێ لە هی عەرەبی نەك هەر ئەمە بەسەریەك وە نووسینی هەمو پیتەکانی ووشە بە لاتینی ڕزگارمان ئەکات لەو دەردی سەری نووسی و ووشەی ( مرکبە ) کان ، وەکوو ووشەی ( پێ‌ڵێنان ، تێ گرتن ، لێ خستن ، پێ لێ هەڵبڕین ، پێ کەنین ) . کەوا هەتا ئێستە هەر خوێندەوارە بە ئارەزووی خۆی چەند یەکی لە مقطع ە کانیان بەسەریەکەوە بە جیاواز ئەنوسێ بەبێ ئەوەی بزانرێ ڕاست و چەوتی کامیە .

٥- نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی تا ئەندازەیەك ڕزگارمان ئەکات لە کێشەی نووسینی ناوو ووشەی بێگانە بە تایبەتی هی عەرەبی کەوا لە زمانەکەماندا بە زۆری بڵاو بۆتەوە . بە بێ ئەوەی توانیبێتمان چارەیەك بۆ نووسینیان بدۆزینەوە یەکێك ئەڵێ ئەمانە لە عەرەبیدا چۆن ئەنووسرێن ئەبێ لە کوردیشدا وا بنووسرێن .

یەکێکی تر ئەڵێ : پێویستە وەکو ووشە کوردیە پەتیەکان سەریش بەم ووشە بێگانانە دابنەوێنرێ بۆ دەستووری گشتی نووسینی زمانەکەمان ئەوانە چۆن نووسراون ئەمانیش وا بنووسرێن .

٦- جگە لەوانەی لای ژووروو نوسین بە پیتی لاتینی منداڵانی کوردستانی خواروو ڕزگار ئەکات لەو سەر لێشێوانەی تووشی ئەبن لە دەرسی کوردی و عەرەبیدا کەوا هەردوو زمانەکە بەیەك پیت ئەنووسرێن بەڵام لەهەریەکەیاندا بە چەشنێکی بە تەواوی جیاواز لەوی تر ئەو پیتانە بەکار ئەهێنرێن لە یەکێکیاندا بۆ نووسینی ( بزوتنەوە ) لەوشەدا ( پیت ) بەکار ئەهێنرێت لەوی کەیاندا سەر بۆرو ژێر لەگەڵ ئەوەشدا بە زۆری ناش نووسرێن لە دەرسێکدا بە قوتابی ئەوترێ ( کەرکوك ) بە ( ك ر ك و ك ) بنوسێ لە دەرسێکی ترا پێی ئەوترێ بە ( ك ە ر ك وو ك ) ی بنووسی . ئەوی ڕاست بێ بەم پەلە پروزێیە هەر ئەم چاکیانەی نووسین بە لاتینیم بە بیرا دێت وە

لەبەر ئەوەش کە نیازم لە نووسینی ئەم باسە زۆرتری پیشاندانی مەسەلەکە و دەرخستنی ئەوشوێنانەیەتی کە پێویستی بە چارەکردن هەیە نەك لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و یەکالا کردنەوەیەکی فراوان بۆیە بەمە واز ئەهێنم دێمە سەر سەرنج دانی باریکی‌یەکەی باسەکەمان .

**چۆن دەست بکەین بە لاتینی نووسین؟**

لە پێشەوە ووتم پیتی لاتینی هەروەها عەرەبیش خۆی وەکو هەیە بە کەڵکی کوردی پێ نووسین نایەت هەر هیچ نەبێ لەبەرئەوەی ئەلف و بێ‌ی لاتینی هەمووی ( ٢٦ ) پیتە کەچی لە کوردیدا بەلای کەمەوە ( ٣١ پیتی دەنگ و پیتی بزووتن - بزوێن) هەیە ئەمە جگە لە چەند دەنگێکی بێگانە بە تایبەتی عەرەبی کە پێویستە بۆ نووسینیان لە ئەلف و بێ کەماندا پیتی تایبەتی هەبێ بۆ ئەوەی بە ڕەوانی بخوێنرێتەوە . جا لەبەر ئەم ناتەواویەی پیتی لاتینی‌کە وا ئەو کەسانەی ویستویانە کوردی بە لاتینی بنووسرێ بەربوونەتە سەرو گوێلاکی دەستکاریەکی زۆریان کردوە بە تایبەتی لە نیشارەت بۆ دانان و نیشانە کردنا . لام وایە بەم قسانە تا ئێستە خوێنەدەوارانم لەوە ئاگادار کردوە وەنەبێ منیش نیازم دروست کردنی ئەلف و بێ‌یەکی لاتینی نوێ بێ‌ئەگینا قسەکەی پێشینانم لەسەر بار ئەبێ کەوتویانە ( ماڵ لە خۆیانە ئەبوو میوانیش ڕووی تێ کرد ) بەلام نیازی ئەوەشم نی‌یە قورسایی بخەمە تای تەرازووی هیچ یەکێ لەو ئەلف و بێ‌یانەوە کە هەتا ئێستە هێنراونەتە مەیدان . ئەمەش وە نەبێ هەر لەبەر ئەوە بێ کە ئەزانم مەسەلەی کوردی بە لاتینی نووسین وە هەڵبژاردنی ئەلف و بێ‌یەکی پڕ بەپیتی زمانەکەمان کارێکە ئەبێ بەتەواوی لە لایەنگری بە دوور بێ لەبەر ئەوەشە کە ئەم ئەلف و بێ‌یانە لەگەڵ ئەو جیاوازیەشدا کە لە میانیاندا هەیە هیچ کامێکیان ئەو لەسەر کردنەوەو لایەنگری توندە ناهێنن چونکە هەر بە تاقی کردنەوەیەکی کەم ئەم ناتەواویانەی لای خوارەوەمان بۆ دەرئەکەوێ تیایاندا :-

١- هەریەکە لەو ئەلف و بێ‌یانە بە تایبەتی بۆ نووسینی شێوەی کوردی بەشێکی کوردستان دانراون بۆیە هەر پێویستەکانی نووسینی ئەوشێوە تایبەتیەیان تیا خراوەتە پێش چاو . ئەلف و بێ‌ی بەدرخانیەکان بۆ نووسینی شێوەی سۆران و هتد . لێرەدا تەنیا بۆ دەرخستنی نموونەیەکی ئەم ناگزوریە ئەم چەند دێڕەی مامۆستا جەمال نەبەز ئەخەمە پێش چاو کەلەسەرەتای ئامیلکەی ( نووسینی کوردی بە لاتینی ) دا نووسیویەتی . مامۆستای ناو براو کەباسی ئەو ئەلف و بێ‌یە ئەکات مامۆستای کۆچکردووە ( جەلادەت بەدرخان ) داینەوە دەڵێ : بەلام لەبەر ئەوەی هەندێك دەنگ هەبوون لەشێوەی سۆراندا تیپی تایبەتیان بۆ دانەنرابوو وەك (ڕێ‌ی قەڵەو ) و ( لامی قەڵەو ) ناچار بووم هەوڵ بدەم بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە لاپەڕە :٨ ) بێ گومان هەریەکە لە هەر هۆیەك ئەبێ ببێ دانەرانی هیچ یەکێ لەو ئەلف و بێ‌یانە لەکاتی دانانی ئەلف و بێ لاتینیەکەیاندا زمانی کوردیان وەکو زمانێکی نەتەوەیی تێکەڵ لەهەموو شێوەکانی کوردستان نەخستۆتە پێش چاو لەبەر هەموو ئەم ئەلف و بێ‌یانە گشت دەنگەکانی زمانی کوردی وەهەریەکەیان چەند دەنگێکی شێوەیەك یا هی چەند شێوەیەکی کوردیان پێ ئانووسرێ .

٢- لەگەڵ ئەو هەموو ئەلف و بێ لاتینیانەدا کە بۆ کوردی پێ نووسین دانراون نووسینی دەنگی پیتی عەرەبی ئەو ووشانەی لەکوردیدا بەکار دێن خراوەتە پشت گوێ کەئەمە مانای ئەوەیە کەهەموو ئەو ئەلف و بێ‌یانە پێناسەرەوەیەکی گەورەی چاکترین ئەلف و بێ یان تیا نیە کەئەویش پێ نووسین وە بەڕەوانی خوێندنەوەی هەموو ئەو دەنگانەیە کەلەدەمی قسە پێکەرانی زمانەکە دێنە دەرێ بەبێ تەماشا کردنی ئەوەی ئاخۆ ئەودەنگانەی تایبەتی زمانەکە خۆین یان لەزمانی بێگانەوە تێ‌ی‌کەوتون

٣- زۆری نیشارەت و نیشانەو نوختە لەم ئەلف و بێ‌یانەدا بەشی زۆری ئەو چاکیانە لەناو ئەبا کە لەنووسینی کوردی بەپیتی لاتینی چاوەنواڕی ئەکەین وەك دەست لەسەر هەڵنەگرتنی پیتە کانی وشە وەوەخت کەم وویستن بۆ نووسین وەلە یەکتری نەچوونیان .

جا بەبیری من ئەم ناگزوریانەی باسم کردن لەوانەنین بەتەقەلای یەك تەنی‌و رێکەوتنی یەکدوانی لەخوێندەواران لەناوانەمێنن جگە لەوەی هیچ گومانم نی‌یە کەگەڵ ناگزوری تریش لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی قووڵ‌و یەکالا کردنەوەی فراوانی مەسەلەکەدا دەرئەکەوێ وە چارە کردنی هەمووی پێویستی بەو هاریکاری و کەڵە کۆمەکیە هەیە کە لەژمارەی پێشوتری ( هیوا ) دا باسم کرد بۆ ئەئەوەی ئەو ئەلف و بێ‌یە دابنرێ بۆ کوردی پێ نووسین کەبەشی هەرە زۆری ئەو چاکی وپێ ئاسەرەوانەی تیا بێ کە لەچاکترین ئەلف و بێدا بونیان پێویستە .

هەندێ کەس ئەڵێن ، هیچ پێویست بەم چاوەڕوانی‌و لێکۆڵینەوەو قسەو باسە ناکات بام هەر لەئێستەوە یەکێ لەم ئەلف و بێ‌یانە کە چاکترینیانە هەڵبژێرین و بیکەینەبناغەو دەست بکەین بەبڵاوکردنەوەو کوردی پێ نووسینی. جا ئەو حەلە ئەگەر بە پێ‌ی پێویستی شێوەکانی ترو بۆ تەواوکردنێ ناگزووریەکانی دەستکاریش بکرێ قەی ناکات.

جێ بەجێ کردنی ئەم بیرەگە لێ قۆرتی وای لە ڕێدایە کە بەتەقەلاو تێکۆشینی یەك تەنی لەتوانای کەسانی، خۆیان لێ ڕزگارکات بۆ وێنە هەندێکیان ئاو بەریت باشە. جارێ ئێمە کێ‌ین کەوا لە ئێستەوە ئەکەوینە ئەم هەڵبژاردنە چۆن یەك ئەگرین ؟ کام ئەلف و بێ چاکترینیانە چۆن بەخەڵکی بسەلمێنین و بەچ دەسەلاتێ بەسەریاندا بسەپێنین ؟ ئایا ئەمە ئامان خاتەوە گێژاوێکی لەمەی ئێستەمان بێ بن تر؟ جگە لەمە خۆ ئەلف و بێ‌ی زمان کەواو کراس نی‌یە بیگۆڕین و پینەو پەڕۆی بکەین ئەگەر ئەم فرمانە ئەمە ئەدە ئاسان بوایە ئێستا لەدنیادا گەلێکمان ئەئەدی لە ئەلف و بێ‌ی خۆی نارەزابێ بەتایبەتی هەموویان دەسەلاتی گۆڕین و بڵاو کردنەوەی ئەم گۆڕینەو بەسەر خەڵکا سەپاندیان لەچاو هی کوردا نایەتە پێوانە[٧]

بەرلەوەی ئەم بەشەی باسەکەمان ببڕێنمەوە دیوێکی کەی مەسەلەی کوردی بە لاتینی نووسین هەیە بە پێویستی ئەزانم بیخەمە پێش چاوی خوێندەوارو زانایان و لێکولینەوەی کە ئەویش ئەمەتە : هەندێ لە خوێندەواران لە ڕووی دڵسۆزیان خوێن گەرمیەوە داوا ئەکەن کە بە پەلە دەست بکرێ بە کوردی بە لاتینی نووسین لەناو خوێندەواران خۆیاندا وە لە هەندێ لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکاندا ، گریمان هەموو خوێندەواران و زانایانی کورد لەسەر یەك ئەلف و بێ‌ی لاتینی یەك کەوتن بە بیری من لەم حاڵەشدا مەسەلەی کوردی بە لاتینی نووسین شەقاوێکی گەورە دوور لە جێ‌بەجێ‌کردن ڕائەوەستێ چونکە بە چە دەسەلاتێك نووسین بەو ئەلف و بێ‌یە بەسەر خەڵکدا ئەسەپێنرێ ؟! ڕێنگە بوترێ خوێندەواران خۆیان لەناو خۆیاندا دەست بکەن بە بەکارهێنانی و گۆڤار و ڕۆژنامەکان بەکاری بهێنن خەڵکیش فێری ئەبێ . بەلام کار بەمە جێ‌بەجێ‌نابێ .

خوێنەرەوە هەموو وەك یەك نین . فێرکردن لە قوتابخانەکان و نووسین لەو دائرانەدا کە زمانی کوردی بەکار ئەهێنن لە دەسەلاتی خوێندەواران وە خاوەن گۆڤار بەدەرە ، گۆڕینی شتێکی گرنگی وەکو ئەلف و بێ‌کە پەیوەندی بە ژیانی زانستی و خوێندەواری و گیانی و کۆمەلایەتی و سیاسی گەلەوە هەیە بەم تەقەلایەکتەنی و دەستە پارچەیی ناکرێ . نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی لەناو خوێندەواران خۆیاندا یا لە لاپەڕەی هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامەدا بەرلەوەی بە لاتینی نووسینی کوردی لە لایەن حکومەتەوە پەسەند بکرێ و یارمەتی بدرێ تەقەلایەکی بێ سوود و ڕەنجێکی بێ‌بەرە نەك هەر ئەمە بگرە گەشەکردنی خوێندەواری کورد دواتر ئەخات بەوەی کە خوێندەوارانی باش لە نێو خوێندەوار و تازە پێگەیشتوانا بۆڕ ئەدات . خوێندەواری پێ‌گەیشتوو لە پێشکەوتوو چوارچێوەیەکی تەسکا قەتیس ئەهێڵێتەوە ، کەلێنێکی گەورەی لە پڕکردنەوە نەهاتوو ئەخاتە میانی گەل و دەستەی خوێندەوارانی باشیەوە . لەبەر ئەمە لە مەسەلەی کوردی بە لاتینی نووسینا خوێندەواران و زانا تێگەیشتوان دوو فرمان ، یان ڕاستتر فرمانێکی دوو لایەنە یان لەسەر شانە دوای ئەوەی چاکترین ئەلف و بێ بۆ زمانی کوردی دائەنێن . ئەبگرە لەو ماوەیەشدا کە خەریکی دانانی ئەم ئەلف و بێ‌یەن لە لایەکەوە پێویستە نەك هەر بە تەنیا باش و بەکەڵکی ئەم هەنگاوە لە گەڵ کورد بگەیەنن بگرە ئەبێ یارمەتی و پیشتیوانیشی دەست خۆیان بخەن بۆ سەرخستنی کارەکە . لە لایەکی تریشەوە ئەبێ تێکۆشن بۆ ئەوەی نەك هەر ڕەزای حکومەت وەرگرن بۆ هاریشتنی ئەم شەقاوە پێویستە هەموو یارمەتیەکی ماددی و مەعنەویشی لێ وەربگرن بۆ لەناوبردنی ئەو قۆرتانەی بەرهەڵستی جێ‌بەجێ‌کردنی ئەکات . وەلام وایە بە هاوکاری هەمووان و یەکگرتنیان لە مەیدانی ئەم فەرمانە نەتەوایەتیەدا گەیشتن بەم ئامانجە ئەوەندە دوور نەبێ وەکو هەندێ بەدبین بە بیریانا دێت . بە تایبەتی ئەگەر نەهێڵین هیچ ناکۆکیەکی کەمان ببێتە هۆی یەك نەگرتنمان بۆ پێکهێنانی ئەم فرمانەی هەموو لایەکمان لە کانگای دڵەوە حەز بە جێ‌بەجێ‌کردنی ئەکەین .

﴿ فرمانی ئێستەمان ﴾[٨]

**چۆن زمانەکەمان بنووسین ؟ .**

باسی ئەو فرمانانەم کرد بوو لەسەرشانی زاناو تێگەیشتوان خوێندەوارانە لە مەسەلەی کوردی بە لاتینی نووسیندا لەوێدا وتبووم کە : (( دوو فرمان ، یان ڕاستتر فرمانێکی دوو لایەنەیان لەسەر شانە دوای ئەوەی چاکترین ئەلفوبێ بۆ زمانی کوردی دائەنێن وە لەو ماوەیەشدا کە خەریکی دانانی ئەم ئەلف و بێ‌یەن لەلایەکی کەوە پێویستە لەسەریان نەك هەر باشی و بە کەڵکی ئەم هەنگاوە لە گەڵ کورد بگەیەنن بگرە ئەبێ یارمەتی

و پشتیوانیش دەست خۆتان بخەن بۆ سەرخستنی کارەکەیان .
لەلایەکی تریشەوە ئەبێ تێکۆشن بۆ ئەوەی ئەک هەر رەزای حکومەت وەرگرن بۆ هاویشتنی ئەم شەقاوە پێویستە هەموو یارمەتیکی ماددی و مەعنەویشی لێ وەربگرن بۆ لەناو بردنی ئەو قۆرتانەی بەرهەڵستی جێبەجێ کردنی ئەکەن )) . ئەگەر چی ئەمەم نووسیبوو بەڵام شتێکی ئاشکرایە کە ئەم فرمانە هەر خۆی بە تەبیعەتی لەوانە نییە بە مانگ و دوو مانگ پێك بێت . ئەخوازەڵا سستی و بێباکی و کەمتەرخەمی خۆشمان بچێتە پاڵ . ئەوە بێگومان خۆی ئەدا لە ساڵان . ئەی کەواتە تا ئەو ساتە جێبەجێکردنی ئەم فرمانە چۆن بنووسین ؟ . هەروا ڕاوەستین ؟ حەزیش بکەین ڕۆژگار لەسەرمان ڕانەوەستێ بۆیە ئەبێ بیری لەم ڕۆشمان وە لەدوا تریشمان بکەینەوە .
لاوم وایە کە مەسەلەکە لەم بارەیەوە سەرنجی درایە دوو رەئی دێتە مەیدان . دەستەیەك ئەڵێن : (کە نووسینی کوردی بە پیتی عەرەبی کارێکی پێنج و دوو ڕۆژی بێ کە زوو بێ یا درەنگ ڕۆژێك بێ ئێمە واز لەم پیتە عەرەبیانە بهێنین ئیتر هیچ پێویست بەوە ناکات کە خۆمان بە چاکردن و ڕێکخستنیەوە خەریك بکەین .
هەتا ئێستە بە گشتی چۆنمان نووسیوە چۆن ڕاهاتووین هەروا بنووسین واتە لە بریتی ( سەر ) ی عەرەبی ( ە ) وە لە بریتی ( بور ) ( و ) وە لە جیاتی ( ژێر ) ی عەرەبی ( ی ) بەکار بهێنین لە کوردیدا بە بێ حەوت و هەشت چوکڵەو زەنەو داکشاوی و هەڵکشاوی و گیراوی لە سەر و لە ژێر و لەم لاو لەو لای پیتەوە دانان وە ئەو تەقەلایەی لەگەڵ چاککردن و ڕێکخستنی پیتی عەرەبی بە فیڕۆ ئەیدەین لەگەڵ پەلە لێ کردن و زوو دەست پێکردن بە پیتی لاتینی بدەین زۆر چاتر و بە کەڵکترە ، بە تایبەتیش هێشتنەوەی ئەلف و بێی عەرەبی وەکوو تا ئێستە بەکارمان هێناوە نا تەواویەکانیمان لە کوردی نووسیندا باشتر بۆ دەردەخات و زیاتر و دیارتر ئەمێنێتە پێش چاو کە ئەمە بە تەنیا خۆی هاندەرێکی باشە بۆ تەقەلادان لە ڕێگەی لێ ڕزگار بوونیا بە پێچەوانەی پینەو پەڕۆ کردن کەوا موشکیلەکەمان لێ ئەشارێتەوە و دەستخەڕۆمان ئەکات بە بێئەوەی هیچ چارەیەکی بنەڕەتی کرا بێ یا بکرێ . ئەمە جگە لەوەی کە ئەو نیشانانەی ئەخرێنە سەر پیتەکانی لە ڕووی زۆری و جۆیجۆییی و هەرکەس بۆ خۆی نووسەرانەوە ئەوەندە سەر لە خوێنەرەوەتێك ئەدەن لەوانەیە کە بە تەواوی پەکی خوێندنەوەی لە کۆڵەوارەکانیان بخەن . نەك هەر ئەمە لە باتی ئەوەی ببن بە هۆی یەکخستنی زمانی کوردی ئەبن بە هۆی فراوان کردنی ئەو کەلێنەی لە نێو شێوەکانی کوردیدا هەیە وەکو ئەوەی بتەوێ بنووسی ( ~ ور ) ( گوڵ ) ( ڕون ) بە بێ هیچ نیشانەیەك لە خوێندەوار بە پێی شوێن مەعنای ڕاستی خۆی بۆ ئەدۆزێتەوە . وە بەم جۆرە بەشی زۆری خوێندەواران تێی ئەگەن چونکە هەریەکەیان وەکو شێوەی قسەکردنی خۆی ئەی خوێنێتەوە بەڵام ئەگەر هاتین نیشارەتمان لەسەر ( و ) یا ( ل ) ە کەدانا وەکو ئەوە وایە کە مۆری شێوەیەکی تایبەتی کوردی لێ بدەین وە سەبارەت بەمە هەر خوێنەرەوەی ئەو شێوە تایبەتیە بە باشی تێ ئەگەن ئەوانی تریان هەر تێی ناگەن یان بە هەڵە ئەچن لە مەعناکەیدا لە پاشا ئەوە هەموو دەنگێك کە تیایاندا هەیە نیشارەتێکی تایبەتی دانرابێ . خوێندنەوەی زۆر دەنگ هێشتراوەتەوە بۆ ( سەلیقە ) و فێربوون و ڕاهاتن و بیستن وە ئەم کارە لە هەم کامێکیانا ئەبوە بە هۆی دواکەوتنی زمانەکە ئیتر بۆچی ئەبێ ئێمەی لە هەموو کەس بێبەشتر قەپاڵی لە هەمووان زلتر داگرین ؟.
دەستەیەکی کە ئەڵێن : نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی بێ نیشانە نیازی خوێندەواری بە تەواوی ناوەڕۆو ئەکات لە باتی ئەوەی بخوێنینەوە بۆ ئەوەی فێر بین بۆ ئەوەی بخوێنینەوە کە ئەمە ئەگەرچی بە درێژایی ڕۆژ دێتەوە سەر دیوی خۆی بەڵام وەخت وەتێکۆشینێکی زۆرمان بەفیڕۆ ئەدا . بۆیە ئەگەر چی ئێمە ئەش زانین کە بە ئەلفو بێی عەرەبی کوردی نووسین شتێك نییە هەتا سەربێ . بەڵام لەبەرئەوەی نازانین بە چەندی تر لەم پیتانە ڕزگارمان ئەبێ پێویستە لەسەرمان دەردی کوردە و تەنی : بزن بۆ شەوێ جێی خۆی خۆش ئەکات ئێمەش بۆ ئەم ماوەیە تا ئەو وەختەی کوردی بە لاتینی ئەنووسرێ شان بە شانی هەوڵدانمان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئەبێ تێکۆشین کە ئەم ئەلف و بێ عەرەبیەش وا لێ بکەین کە کەم و زۆر پێویستی نووسینی زمانەکەمان پێ بەجێ بهێنرێ بە تایبەتی لەم کاتەدا کەوا زمانێکی نەتەوایی کوردی لە پەیدابووندایە لە هەموو کاتێکی کە پتر پێویستمان بە ڕاست و ڕەوان نووسین و خوێندنەوەی هەموو ووشەیەکی زمانەکەمان هەیە نەك هەر بۆ ئەوەی هەموو کوردێك ووشەکانی شێوەی ناوچەکەی خۆی بە ئاسانی و ڕاستی بخوێنێتەوە بکرە بۆ ئەوەش کە ووشەکانی شێوەکانی کەی کوردیش بە ڕاست و ڕەوانی بخوێنێتەوە و فێر ببێ . وەبۆ ئەوەی بگەین بەم نیازە چارەمان نییە خۆشمان بێ و ترشمان بێ نیشارەتی وەك : حەوت ، هەشت ، نوختە ، چوکڵە ، داکشاوی ، هەڵکشاوی و یا شتی وا بخەینە سەر پیتە عەرەبیەکان بە پێی پێویستی زمانەکەمان ، ڕەنگە لە میانی ئەم دوو ڕەئیە پێچەوانەیەشدا ڕەئیەکی مام ناوەندیش هەبێ کە خاوەنەکانی بڵێن : لە هەردوو ڕەئی پێشوودا بەشێك ڕاست هەیە نەك هەمووی ڕاستی . چونکە جارێ خاوەنانی ڕەئی یەکەم چ ڕێگایەکیان دانەناوە بۆ نووسینی ئەو ووشە بێگانانە کە لە کوردیدا بەکارئەهێنرێت بە تایبەتی ئەو ووشە عەرەبیانەی پیتی ( ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ ) یان تێدایە . هەروەها بۆ نووسین ئەو ووشە کوردیانەش کە لە چەند ووشە یا پارچە ووشەیەك پێك هاتوون وەکو دەست ڕاهەڵگرتن ، پێخۆر ، تێ کۆشین ، لێ کۆڵینەوە هتد . خاوەنانی ڕەئی دووەمیش ئەك هەر ئەم قۆرتانەیان چارەنەکردووە . هەر یەکەمیشیان بۆ خۆی جۆرە نیشانەیەك دائەنێ یەکێکیان ( ڕ ) ی ڕۆژ ، کور ، لە یەکەمیان دا هەر وەکو خۆی وە لە دووەمیاندا بە دوو ( ر ) ئەنووسێت، یەکێکی کەیان لە هەردوو ووشەکەدا بەو (ڕ) ی ئەنووسێت هەندێکیان ( ٧ ) لەسەر ( ر ) یەکە دائەنێن . هەندێك (٨) و هەندێك (٧) یان هەشتەکە یاسێ نوختە یانوختەیەك ئەخەنە ژێر هەروەها لە نووسینی نیشارەت و جۆر و جێگەی دانانی نیشارەتی پیتەکانی تریشدا جیاوازیەکی زۆریان هەیە جگە لەمانە خاوەنانی ئەم ڕئیانە هیچ کامێکیان ئەچوونە بنج و بناوانی دەردەکە دەردی گرانی نووسینی کوردی ئەوە نییە کە دابنرێ بە پیتی نیشارەتدا بنووسرێ باشە یان هی بێ نیشارەت دەردی بێ دەرمان یان هیچ نەبێ تا ئێستە بێ دەرمان ئەبوونی یەك چەشنی یان یەك ئەسەقییە لە نووسین نملا ی کوردیدا . کوردی بە پیتی نیشارەتدار چاتر بنووسرێت یان بە هی بێ نیشارەت زانینی ئەم ڕاستییە بە کردەوە چ بایەخێکی ئەوتۆی نییە و ناشی بێ ئەگەر هەموو خوێندەواران و نووسەران بە گشتی ئەو جۆرە نووسینە پەسەند نەکەی وە ئەگەر وەکو جۆری نووسینی زمانانی کەی لێ نەکرێ کەوا پەیڕەوی ئەکردنی دەستووری نووسینی لەسەر ڕۆیشترا و ئەبێ بە مایەی نزم بوونەوەی پلەی خوێندەواری ئەو کەسە لەناو خەڵکدا ئینجا با بێینە سەر پیشاندانی ئەو قۆرتانەی لە مەسەلەی نووسینی کوردی بە پیتی عەرەبیدا دێتە ڕێمان وە چوونی بۆ چوونی چارەکردنیان . هەندێ لەم قۆرتانە ئەمانەن :

١- چەند پیت نیشانەی پێویستە وە نیشانەکان چۆن بن و لە کوێدا بنووسرێن[٩]
٢- ووشەی بێگانە بە تایبەتی ئەو ووشە عەرەبیانەی ( ص ، ض ، ط ، ظ ، ذ ) یان تیایە چۆن بنووسرێن ؟.
٣- ئەو ووشە کوردیانەی لە چەند ووشەیەکی لێکدراو دروستکراون چۆن بنووسرێن ؟ ئینجا ئەمەش ئەمێڵمەوە بۆ جارێکی تر .

بەمانە ئەو رسالەی ناوی کوردییە نیشارەتەکانی تر هەر شتێك هەن من موافیق نیم و لەباوەڕی منا هەموویان غەڵەتن . غەڵەتەکەشیان دیارە لە ناحیەی عیلمیەوەیە ئەوە درێیەکی زۆری ئەوێ لەم کاغەزەدا جێی نابێتەوە ( وەك مامۆستا سجادی نووسیوویەتی بەبێ دەستکاری ئیملا ڕوونووس کراوە ) . ئەگەر چی داهێنانی نیشارەتەکانی سەر ئەم چوار حەرفە داهێنانی مانگە دەستکردە کە نییە شانازی بۆی لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕ بکەن گەلێکم پێ خۆش بوو کەوا لە ( فیکری مامۆستا علاء الدین و منەوە بێت ) و هیچ کەس هەقی نەبێ بیکا بە هی خۆی بەڵام داخەکەم وادیارە مێژوو هاوکاری ئەم داهێنانە نایابانەش بەمن ڕەوا نابینێ ئەڵێم بە من چونکە مامۆستا سەجادی کە لەبەری تری وای لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دۆزیوەتەوە کە ئەگەر ئەمەشی لە کیس بچێ باکی نەبێ .
ئینجا بۆ ئەوەی هەروەك لە هونەری داهێنانەکە بێبەش بووم تاوانی ناڕاستیشم نەدرێتە پاڵ بە پێویستی ئەزانم کە بڵێم . داهێنانی نیشارەت بۆ پیتی عەرەبی جگە لەوانەی کە عەرەب خۆی دایناوە شتێکی ئەوەندە کۆنە لام وایە مێژووش بە تەواوی ئەزانێ کە کەی و لە لایەن کێوە دوو نوختەی تر خراونەتە بن ( ب ) وناو (ج) و سەر (ز،ف) و سەرێکی تر خراوەتە سەر (ك) بۆ ئەوەی بکرێت بەو ( پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ ) بۆ نووسینی ئەو پیت و دنگانەی کە عەرەب هەر ئەیانزانیوە هەن وە تا ئێستەش بە ئاسانی و ڕەوانی لە دەمیان نایەنە دەرێ ئەمە بە گشتی . لە کوردیشا ئەوەی من بزانم و ئاگادار بم وەختی خۆی لە گۆڤاری ( ڕۆژ کرد ) دا کە لە زمانی عوسمانیا لە ئەستەمووڵ دەرئەچوو پڕۆژەی یا ( گەڵاڵە ) ی ئەلف و بێیەکی عەرەبی نیشارەتدار نووسراوە بەڵام وا دەر ئەکەوێ ئەم بیرە ئەهێنراوەتە دی و هەر لە خانەی پڕۆژەدا ماوەتەوە چونکە هیچ نووسراوێك یا چاپکراوێکمان بۆ نەماوەتەوە کە بەم ئەلف و بێ نیشانە دارانە نووسرا بێ تەنانەت گۆڤاری ڕۆژ کرد خۆشی بەو پیتە نە نووسراوە لە ساڵی ١٩٢٨ دا لە لایەن مامۆستا مەلا

سەعید صدقی کابانەوە نامیلکەیەکی حەفتا لاپەڕیی لە بەغدا لە چاپ درا بە ناوی ( مختصر صرف و نحوی کوردی ) یەوە کەوا پێش لە چاپدانیشی بە چەند ساڵێك بە دەست نووسی لەناو قوتابییاندا هەبووە وە لە قوتابخانەکانی سلێمانیدا بە دەرس ئەوترایەوە ، مامۆستای ناوبراو لە لاپەڕە سیّی نامیلکەکەیا ئەنووسیّ : ( دەبیّ بزانین ئەو حەرفە هیجایانەی کە لە کوردیدا عمل دێنرێن و کلماتیان لیّ دروست دەبیّ چەندن و چین . ئەو حرفانە ( ٢٨ ) حرف هجای عربی و ( ٨ ) حرفی ترن کە غەیری عربین و ئەمانەن ( پ ، چ ، ڤ ، گ ، ل ، و ، ی ) کە وابوو حرفات هجای کوردی ٣٦ حرفن ( أ ، ب ، ت ، ث ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ذ ، ر ، ز ، س ، ش ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ل ، ن ، و ، و ، ی ، ی ) ئەو کلماتەی کە کوردی پەتی بن ( ث ، ذ ، ض ، ط ، ظ ) یان تیدا نی یە هەر کلمەیە کە لە کوردیدا دەبینریّ و لەم حرفانەی تیّدابوو ئەو کلمەیە کوردی ئەصل نی یە و نابیّ بە کوردی بزانین یا دەبیّ ئەو نەوعە کلمانە بە جاریّ لە کوردیدا ترك بکرێن خۆ ئەمەش ممکن نی یە یا دەبیّ لەسەر شکلّ و شێوەی خۆیان بنووسرێن نقط لە تلفظدا بە شێوەی کوردی دەخوێنرێتەوە . ئەو هەشت حەرفانەی کە عربی نین شکلێکی جوێیان نیە اما بعضیکیان لە نقطەی زیادە و بعضیکیان یا بە تیّ فکرینێکی کەم و یا بە دانان ئیشارەت ( ٧ ) جویّ دەکرێنەوە و کراوە . ( ی ) ی خوارە لە ( و ) ی کوشراو و ( ی ) راست جویّ دەکرێنەوە . کوت و مت وەك نووسینی مامۆستا سەعید صدقی نووسراوەتەوە . وەکو ئەبینین مامۆستا سەعید صدقی دانانی ( ٧ ) ی سەر (و) و ( ی ) ی هەر وەکوو نوختە زیادەکانی ( ڤ ژ چ ) باسکردووە بیّ ئەوەی هیچ بایەخێکی تایبەتی پێوە ببەستیّ . زۆرتری وای پیشان ئەدا کە ( ٧ ) لەسەر ( و ) و ( ی ) دانان شتێکی زانراو بوو بیّ لەو کات و ناوچەیەدا کە ئەو نامیلکەکەی تیا نووسیوە هیچ مۆرێکی دەستکردی خۆی پایەکیکی کەی لیّ نەداوە کەلام وایە ئەگەر بی ویستایە لە گیانی زانستی پەروەری نەختیّ کەم بکاتەوە هەر ڕاستەو ڕەوان بۆی ئەلوا ناوی خۆی لیّ بنیّ . لێرەدا نابیّ ئەوەمان لەبیر بچیّ کە ئەم قسانەی مامۆستا سەعید صدقیش لە هانەی قسە نەترازان مەیدانی بەکارهێنیان تاقی نەکردووە نەك هەر لە چاپکردنا . کە ئەتوانریّ نەبوونی پیتی نیشانە دار بکریّ بە بەهانەیەکی ڕاستەقینە بەڵام مامۆستای ناوبراو لە نوسینەکانیششیا هەروەها لە ناو قوتابییەکانیشیا دانانی ئەم نیشارەتانەی ئەوەندە مەبەس نەبوو زۆرتری پشت ئەستور بوو بەوەی کە بە ( تیّ فکرینێکی کەم ) ( و ) ( ی ) یەکان لێك جویّ بکرێنەوە .

دوای ئەمە لە ساڵی ( ١٩٢٩ ١٩٣٠ ) دا مامۆستا( تۆفیق وەهبی ) جزمی یەکەم ( دەستووری زمانی کوردی ) چاپکرد بە ئەلفو بیّیەکی ئیشارەتدار کە پیتەکانی بە تایبەتی بۆ ئەم ئیازە داڕێژرا بوو لەم کتێبەدا نەك هەر ئەو ( چوار حەرفە ) ی کە مامۆستا سجادی بە داهێنانی خۆی و خۆمیدا ئەنیّ ئیشارەتیان بۆ دانراوە گەلیّ پیت و دەنگ و بزوێنی کەش ئیشارەتیان بۆ کراوە بە ئەندازەیەك کە ئەو زۆر ئیشارەتە لەگەلّ گەورەیی گۆڕین و فراوانی شەقامەکە و دواکەوتویی خوێندەواری کوردی پەتی ئەوەیان دەرخست کە ئەم کتێبە نایابە کەڵکی خۆی لیّ وەربگیریّ . نەك هەر ئەمە لە دەوری متصرفیەتی مامۆستا تۆفیق وەهبی دا ڕۆژنامەی ژیان لە سلێمانی چەند ژمارەیەکی بەم چەشنە پیتە عەرەبی یە فرە نیشانەی دەرکرد کە لێرەشدا وەکو لە پێشەوە ووتم گۆڕینەکە ئەوەندە زۆر بوو بە خەڵك قووت نەچوو بۆیە تەقەلاکە سەری نەگرت .

لە هەموو ئەم ماوەیەشدا تاکو ئەرا خوێندەوارانی کورد لە نووسراو نووسینی تایبەتی خۆیاندا ئەم ئیشارەتانەیان بەکارهێناوە بە تایبەتی بۆ نووسینی پیتی ( ی ، ل ، م ) . بە مانەی لای ژوورووەدا دەرئەکەویّ مەسەلەی داهێنانی ئیشارەت لەسەر پیتی عەرەبی لە کوردیدا شتێکی کۆنە . ئەرێتێك نیە مامۆستا سەجادی و من دامان هێنابیّ بەڵام وەنەبیّ ئێمەش یا وردتر بڵێم مامۆستا سەجادی هیچی لەم مەیدانەدا نەکرد بیّ ئەوی ڕاست بیّ من خۆم لە دەرهێنانی یەکەم ژمارەی ( گەلاوێژ ) ەوە مەسەلەی یەکخستنی نووسین و بە تایبەتی نووسینی پیتی ( ل ، ی ، و ) ی کوردیم وەکوو قۆرتێکی گەورە بەرەنگاری بوو کەوا بە بیّ لابردنی ماوەی پێشکەوتنی خوێندەواری لەناو کوردا زۆر تەنگ و تەسك ئەبیّ . بە بیرما هات کە بۆچی تەقەلایەك نەدریّ کە ئەو ئیشارەتی ( ٧ ) ی خەڵك لە خۆیانەوە بڕیاری دانانیان داوە لەسەر پیتی ( ل و ی ) پیتی تایبەتی بۆ دابڕێژرێت لە چاپدا بۆ ئەم ئیازە قسەم لەگەلّ ( سەید حسین عانی ) مودیری مدرسە التفیض الاهلیە کرد کەوا مەکینەیەکی لانیوتاپیان هێنا بوو . ئەگەر چی ناوبراو بڕیاریدا کە بنوسیّ بۆ ئەمریکا بۆ هێنانی ئەو پیتانەی لە کوردیدا بەکارئەهێنرێن و داڕشتنی پیتی ( ل ی و ) بە ئیشارەتی حەوتەوە بەڵام هەندیّ هۆی تایبەتی هەردوو لار گەرم بوونی شەڕ پەکی ئەم تەقەلایەیان خست . دوای ئەمە بە چەند ساڵێك لە کاتێکی بە تەواوی جیاوازدا ئەم قسەیەم لەگەلّ مامۆستا سەجادی کرد کەوا پەیوەندیەکی تەواوی لەگەلّ چاپکاری پەیدا کردبوو ..ئەوەی من ئەمویست لە مامۆستا سەجادی ئەوە بوو کەلەسەر حسابی خۆی داوا بکات نەك هەر پیتی ( ل ، ر ، و ، ی ) ی بۆ دابڕێژن بگرە ( ی ) ..کی داکشاوی دارو ( ك ، گ ) یێکی سەر نووشتاوە و ( چوکلە ) یەکی بیّ نوختەش بۆ نووسینی ( ی ) ی ( شیر ) و ( ك ) ی کوێر وەگی گوێز و ئەو بزوێنەی لە بەینی ( ك ) و ( ر ) ووشەی ( شەکر ) دا هەیە ئەوی ڕاست بیّ مامۆستا علاء الدین سجادی پیّی سەلماندم کە ئەم هەموو پیتانە پێویست نین وە ئەم هەموو ئیشارەتانە سەر لە خوێندەوار تێك ئەدەن ئینجا فیکری هەردوکمان هاتە سەر ئەوە تەنیا چوار حەرف هەیە موشکلە پەیدا ئەکەن ( ر ی ل و ) وە قەرار وابوو هەریەکە لەمانە بۆ ناسینەوەیان ( ٧ ) ی لەسەر دابنریّ وە ئەو ناردی ئەم ئیشارەتانەیان داڕشت . مامۆستا علاء الدین سجادی ئەبوایە داڕشتنی وێنەی ئەم داهێنانی خەڵکە ئەکەوتە قافێکی تر

کە ئەمەش بە بیری من خزمەتێکی شایانی سوپاسی مامۆستا علاء الدین لای ئەوانەی ئیشارەت دانان بە پێویست ئەزانن لە نووسینی کوردیدا

پەراوێزەکان

[1] گۆڤاری هیوا ژمارە( ٤ ٦ ) ساڵی ١٩٥٧

[2] لێرەدا بە پێویستی ئەزانم کە چەند قسەیەك بە گویّی کاربەدەستانی بەرێزی ( یانەی سەرکەوتن ) دا بچرپێنم : یانە بە پیّی ئەو پەیامەی گرتویەتە ئەستۆی خۆی وە لە ڕووی دەست ڕۆیینەوە تاقە دامەزراوێکی کوردە، کە لە وزەیدا بیّ بە ئەرکی پێك هێنانی ئەم چەشنە کۆکردنانەوە دا هەستیّ نەك هەر بۆ ئەم فرمانە بە تەنیا بگرە بۆ لێکۆڵینەوە وە چارەکردنی هەموو جۆرە ناگۆرووێکی کەی زانستی و خوێندەواری کوردیش وە بەم جۆرە کردەوانەیانە نەك هەر پەیامی ڕاستەقینەی خۆی بە گەلی کورد ڕائەگەیەنیّ هەروەها ڕێگەش پا ئەکاتەوە بۆ دامەزراندنی ( ئاکادیمی ) یەکی کوردی . ئەو بیرە بەرزە جوانەی مامۆستا جەمال ئەبەز لە نامیلکەی نووسینی کوردی بە لاتینی دا لەزمان مامۆستا عوسمان سەبری یەوە ئەی گێڕێتەوە

[3] جۆرج برنادشۆ : نووسەری بە ناوبانگ گلەیی لە دەستووری زمانی ئینگلیزی گەیشتبوە ئەندازەیەك کە لە وەسیەت نامەکەشیا بەشێکی لە میراتەکەی تەرخان کردبوو کە لە ڕێگەی چاکردنی ئەلف و بیّی ئینگلیزیەدا سەرف بکریّ .

[4] ئەگەر سەرنج بدەین ئەبینین ئەم شتانە لەچاپکردن و تایپ کردندا ئەهیمیەتێکی ئەوتۆیان نامێنیّ بەڵام ئەمە بەشی زۆری لەبەر ئەوەیە کە چاپکردن و تایپکردن لە خوێندنەوە نزیکترە تا نووسین

[5] لێرەدا ئەبیّ ئەوەمان لە بیر نەچیّ کەوا کەمی ، یا هەر نەبوونی دەرسی کوردی لە قوتابخانەکان ڕەنگە مامۆستاکانی ئەم سەریەشەیە ڕزگار کردبیّ بەڵام قوتابی هەژار لە قوتابخانەی ژیانیانا بەینیّ هەر بە دەستیەوە ئەناڵێنیّ .

[6] بەکەڵکداری ئەزانم لەخوارەوە ئەم چەند دێڕە بخەمەوە بەرچاو کاوەختی خۆی لەلایەن نووسەری ئەم باسەوە لەگەلاوێژ لەوەرامی خوێندەوارێکدا نووسراوە کەلەدوای کردبوو گەلاوێژ چەند لاپەڕەیەکی بکا بەلاتینی : ( لامان وایە خوێندەوارێکی کورد نیە لە ئەلف و بیّی نووسینی ئەمڕۆی کوردی ڕازی بیّ وە وەکو چەند جار باسمانکردووە بۆ ئەوەی ئەلف و بیّیەکی باش پڕ بە پێستی ئەواو بۆ زمانی کوردی دابنرێت پێویستمان بەتێکۆشینی زۆر هەیە بۆ بەستنی کۆمەڵێك کەهەموو زانایانی زمانی کوردی چەخۆچەیێکانەی تیا بن جگە لەمانە پارمەتی پسپۆڕانی ( زانینی پێگەیاندنی منال ) پشمان زۆر پێویستە ئەرسا دوای لێکۆڵینەوە و بەراوردێکی زۆر ئەتوانریّ ئەو ئەلف و بیّیە دابنرێت کەزمانی کوردی بەئاسانی پیّ بنووسرێت وە بە ڕەوانی بخوێنرێتەوە . ئەگینا وا گەلاوێژ هات لەسەر قسەی ئێوە چەند لاپەڕەیەکی تەرخان کرد بوو بۆ بڵاوکردنەوەی کوردی بەلاتینی نووسین لێرەدا هەژارو یەك کۆسپمان دێتە ڕیّ یەکەمیان ئەوەیە کەئیاز لەنووسین بە ئەلف و بیّی لاتینی چی یە ؟ ئەوەیە کە (A,B,C,D) وەکولای خۆمان ناو ئەبرێت وەرگرین و ئەلف و بیّی لاتینی چەوە کو خۆی و چە وەکو ئینگلیزو فەرەنسیەکان بەکاری ئەهێنن بە کەڵکی کوردی نووسین نایەو گەلیّ پیت و دەنگی ناتەواوە . خۆ ئەگەر بێین ئەلف و بیّی لاتینی وەکو کەرەسەیەکی خاو وەرگرین وە ناوی خۆیانیان لەسەر لابەرین بە پیّی پێویستی زمانەکەمان سەر لە نویّ ناویان بۆ دابنێین پێم نالّیّ بەچ حەقێك ئەتوانین بیری خۆمان بەسەر خوێندەوارانا بسەپێنین ؟ بەلای گەلاوێژەوە هیچ تاقە کەسێك حەقی ئەمەی نی یە . ڕەنگە بڵێین : بۆ بەر لاتینیە نانوسین بڵاوبۆتەوە ؟ ئەڵێین : چونکە سیّ چوار لاتینی هەیە لەناواندا یەکێکیان ئەوەیە کە لە سووریە ڕۆژنامە و گۆڤاری پیّ دەرئەچیّ کە ئەمە کتومت ئەلف و بیّی تورکی تازە قەلایە ، دووەمیان ئەلف و بیّیەیە کە بە هی ( تۆفیق وەهبی ئەدموندسی ) ئەناسریّ کە دانەری ئەم ئەلف و بیّیەش وەکو برا کوردەکانی سووریە بەڵگەی زۆری چاکی ئەلف و بیّکەیان ئیشان ئەدەن . سیّیەم ئەلف و بیّ ئەوەیە کە کوردەکانی وڵاتی سۆڤیەت پیّی ئەنووسن و ئەخوێنن جگە لەمانە ئەلف و بیّی ( میجەرسون ، م . پاشقە ) هەروەها لەگەلّ کۆمەڵیّ ئەلف و بیّی تر کە هەر بێگانەیەك ویستبێتی کوردی فێر بیّ بۆ خۆی دایناوە . جا ئێمە لەم هەموو ئەلف و بیّیە کامیان پەسەند بکەین و بەکامیان بنووسین ؟ ڕەنگە بوتریّ بە چاکترینیان ، وەلیّ کامیان چاکترینیانن ؟ وە ئاخۆ ماوەی ئەوە نیە کە لەم هەمو ئەلف و بیّیانە یەکێکی وا بهێنرێتە کایەوە کە چاکی هەموویانی تیا بیّ و خراپی و ناتەواوییەکانیانی لیّ بەدەر بیّ ؟ وەرامی ئەم دوو پرسیارە پێویستی بە بەستنی ئەو کۆمەڵە ئەکات کە لە سەرەوە باسمان کرد .

گەلاوێژ ژ ٧ ١٩٤٦ .

[7] گۆڤاری ( هیوا ) ساڵی ( ١٩٥٨ ) ژمارە (٩).

[8] بەر لەوەی دەست بدەمە ئەم بەشە دواییەی باسەکەم بە پێویستی ئەزانم چەند قسەیەك لە نووسراویّ بکەم کە ڕۆژی ٧-١٠-١٩٥٧- هاوڕێی دێرینم مامۆستا علا ءالدین سجادی بۆی نارد بووم . مامۆستا سەجادی لە نووسراوەکە ئەڵیّ : بیستم مطالێکت ناردووە بۆ گۆڤاری ( هیوا ) لە لایەن ئیشارەتەکانەوە قسەت کردووە هەر ئەوەندەم بیستووە و هیچ تر ئیتر نازانم چی یە ؟ نازانم تا ئەو ساڵە کە من و تۆ دانیشتین و قسەمان لێوە کرد فیکری هەردوکمان هاتە سەر ئەوە کە چوار حەرف هەیە مشکلە پەیدا ئەکا (ر ، ی ، ل ، و) ئەمانە بوون . ئەوە بوو قەرار وابوو کە ئەمانە بۆ ئەوەلێك جیا بکرێنەوە هەریەکە حەوتێکیان لەسەر بیّ، لە پاشا من ناردم ئەم ئیشارەتانەیان داڕشت و یەکەم شتێك کە بەمانە لە چاپ درا رسالەی ( ناوی کورد ) بوو لەوێدا من باسم کردووە لە مقدمەکەدا کە ئەمانە لەسەر فیکری من و تۆ بووە ئیتر لە غەیری ئەم چوارە من بەش بە حاڵی خۆم موافیق نیم بۆ هیچ تر . مەبەست لەو کاغەزە ئەمەیە کە تۆ ئەوەت لە فیکری بیّ بۆ ئەوە ئەوەك قسەکان یەك نەگرنەوە . داهێنانی ئەم چوار حەرفە لە فیکری ئێمەیە و کەس حەقی نیە بیکا بە هی خۆی دەلیلیش تەئریخە یەکەم شتێك کە لە پێشا چاپ کرا بیّ

# ئەدەبیاتی کوردی

# (شاعیرەکانمان)

-١-[١]

١٩٣٢

شاعیرەکانمان هەتا ئێستا بڕوا ناکەم لە کەلیمەی مەدح و ستایش زیاتریان بیستبێ. یەکێ بەتووتی شەکەر گفتار و ئەوی تر بە بولبولی شیرین کەلام ناویان لێ ناون. هەرچەندە ئەم لەقەبانەیان لە لاپەڕەی چ پارچە کاغەزو گۆشەی چ ڕۆژنامەیەکدا بۆ نەنووسراوە بەڵام لەمێشکی خۆیان و هەندێ دەوروپشتەو ناسیاویاندا زۆر چاك جێگیر بووە. بەڵێ هەتا ئێستا بێ لێکدانەوە مەدحمان کردون لەمەشدا مەغدورین چونکە پیاو لە تاریکیدا جوان و ناشیرینی لا وەك یەکە بەڵام لەمەودوا ئەو دەورە ڕۆیی کە بەزەرد بوترێ زێڕ و بەسەدەف بوترێ مرواری. لەمەودوا ڕۆشنایی زانستی بەرچاویان ڕوناك ئەکاتەوە هەموو شتێ وەکو خۆی ئەبینیت و پێوستە هەر شتێ بەپێی بەرزی و نزمی دابنێین. بەدرك نەڵێین گوڵ و بەگوڵ نەڵێین درك. لەپێش ئەوەدا کەخۆم بخەمە ئەو دەریا قوڵەوە و گەوهەری یەگانەی شاعیرەکانمانتان بۆ لەخارو خاشاك جوێ بکەمەوە لە پێش ئەوەدا بە وردبین سەیری وردو درشت و ئاشکارو پەنهانیی شیعرەکانیانتان بۆ بکەم. بەڵێ لە پێش ئەوەدا کەپووشتان لە کا بۆ ببژێرم خەرمانی شیعرتان بۆ بە بابکەم. پێویستە وەسفی گەوهەری یەگانەی ئەدەب، (شعر) تان بۆ بکەم. پێویستە لە

[١] ڕۆژنامەی (ژیان) ژمارە (٣٣٥) (٢٥) ی ئابی ١٩٣٢.

ڕەئی و گفتوگۆی شیعر ئاسیمان شارەزا بکەم، تاکو خۆتان بیناسن ئەگەر دیتان. شعر تەرجومانی دڵە. چی بەدڵا بێت ئێش و ئازار دەردوخەفەت، هیواو نائومێدی، شین و شادی، شیرینی و تاڵی، خۆش ویستن و قین و گومان و باوەڕ ترس و بێ باکی، خراپی و چاکیمان بەکەلیماتی ڕێك و پێك لە شێوەیەکی دڵگردا بۆ دەردەخات کە هەموو کەس لە ئانی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا ئەبینێ. شیعر، چرایەکە تاریکی ڕێی ژیانمان بۆ ڕۆشن و یارمەتیمان ئەدات لە دۆزینەوەی حەقیقەتدا. شیعر: جوانی هەموو شتێکمان بۆ دەردەخات زاتەن گیانیش وێڵی جوانی بەو هەر تینوێتی پێ ناشکێ. شیعر: لە ئاوازی دڵگیری بولبول، لە سروەی سۆزەی بەیان، لە تافەتافی ئاوی سەر قەڵبەز، لە فڕەفڕی باڵی باڵندە، لە ورشەی گیا، لە تریفەی مانگەشەو، لە ئاوابوونی ڕۆژ و هەڵهاتنی مانگ، لە جریوەی ئەستێرە، لەشەپۆلی دەریا، لە بریسکەی بروسکە، لە گرمەی هەور، لە هاڕەی باران، لەدەنگی مۆسیقا مانایەکمان بۆ دەردەهێنی کە لە هەموو دڵێکدا شاردراوەتەوە. بەڵام هێشتا دەریان ئەبڕیوە تاشیعرەکە نەخوێندنەوە شیعر جوانی مانەوەو مانەوەی جوانیە. شیعر ژیانە بێ دەنگ و سەنگ، هاوار کەرو قیژێنەر، ڕووخۆش و مۆن، چاو بەگریان و دەم بە پێکەنین و پڕ لە دڵداری دێت و دەچێت، شیعر وێنەیەکی ژیانە لە هەقیقەتی ئەزەلیەوە وەرگیراوە، ئاوێنەیەکە ناشیرینی تیا جوان ئەبینرێ، مەنزومەیەکی درێژ سەرچاوەیەکە تا ئەبەد جوانی و حیکمەتی لێ هەڵ ئەقوڵێ، شیعر پەچە لەڕوی جوانیەکی پەنهان لا ئەدات، وەکو (شیلی) ئەڵێ: شیعر لەشەوانی لێك بڕاندا فوو لە کورەی دڵداری ئەکا، لە ڕێگای ژیاندا چرای هیوا بۆ تێکۆشەران

هەڵ ئەگیرسێنێ. لەگەڵ چنگی ئاسنینی گەردوون دەم بە پێکەنین دەست بازی ئەکات، لەگەڵ شنەی نەسیم گەمە بە پرچی نازداران ئەکات لەبەر چاوی نا ئومێدان ژین شیرین ئەکاتەوە.

-٢-[٢]

شیعر تەرجەمەی نیگای ئاسکێکی سڵ و مانا خوێندنی باڵندەیەکی گەردن پاك و خاوێن، پیرۆز و بەرزە، مەدح و ستایشی ڕیاو جنێوی درۆی بەقەد ئاسمان و ڕێسمان لێ دوورە. شیعر بەخوێنی دڵ و فرمێسکی چاو ئەنووسرێ بۆیە هەموو ڕازێکی دڵ و بینراوێکی چاو وەسف ئەکات. شیعر ئەمانەیە و گەلێ لەمانە بەرزترە. شیعر وەکو ئەڵێن (وتەیەکی وەزن دارو قافیەدارە) بەڵام ئەبێ بزانن کە کەلیمات لەش و، مانا گیانیەتی. لە کەلیمەی ڕێك و پێك و مانایەکی بەرز و بڵند شیعر پەیدا ئەبێ. لەپاش ئەمەی کە زانیتان شیعر چی یە ڕەنگە هەمووتان بەیەکجار هاوارکەن بە ڕووما بڵێن: کوا بۆ وەکو تۆ ئەڵێیت کورد شیعری نی یە؟! بەڵێ هەمووتان بەتوڕەییەوە ئەم پرسیارە ئەکەن بەڵام من جوابتان نادەمەوە خۆتان شیعری کوردی بخوێننەوەو بزانن چۆنن لەگەڵ ئەو وەسفی شیعرەی کەبۆم کردن ئەگەر (وتنێکی وەزن داری قافیە دار.) زیاترتان دی بڵێن هەیەتی، ئەگینا ئێوەش لەگەڵ من بڵێن کورد شیعرێکی وای نیە، کە لە ئەدەبیاتی عالەمدا شوێنێکی ببێ یا شایان بێت، نالێم هەر شیعرمان نیە. بەڵێ هەندێکمان هەیە بەڵام کە گوڵە ئەستێرە بەشەو پێی ئەوترێ ئاگر یەعنی ناتوانین لە بەرچاوی دۆست و دوشمن خۆمانی پێوە هەڵکێشین. کەوتە شیعرمان نیە، یەعنی شاعرمان نیە (محوی، سالم/ کوردی/ نالی، ناری، نۆدێ، زێوەر، حمدی و مختار کێن؟!

[٢] ژیان ژمارە (٣٣٦) (١)ی ئەیلولی (١٩٣٢)

بەڵێ پێویستە پێتان بڵێم ئەمانە کێن و چین، ئەگەر شاعر ئەبن بەڵام پێویستە ئێوەش لەسەرم ڕاوەستن تا لەمەڵێکی تردا یەکەیەکە باسیانتان بۆ بکەم، چاوەڕوانی ئەوە مەبن کەبیان خەمە ترازوی چەرمینەوە، چونکە شاعران ئەکێشرێن بە شعرەکانیاندا، شعرەکانیان لەگەڵ ئەو وەصفی شیعرەی کە بۆم کردن ڕێك ئەکەوێ یان ئەمە لەگەڵ هەمووی یالەگەڵ هەندێکی؟ کە جوابی ئەم پرسیارانەمان دایەوە یەعنی شیعرەکەیان کێشاوە، ئەگەر حەزئەکەی بڵێ خۆیمان کێشاوە چونکە ئێمە لە هەموو کەس بەری فکر، کردەوەی دەست و وتەی دەمیمان گەرەکە. زۆری شاعرەکانمان ئەگەر لەبەر ئێوە نەڵێم هەموویان دڵدارێکی خۆ پەرست و بێ باکن وەکو یەکێکیان ئەڵێ:

مئویارم لەکونجێ دانیشین

چە باکمە عالەمێ زێر و زەبەر بێ

بەزۆرو بەخواهش ئەگرین و ئەگریەمن لەباسی چاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و ڕووی ڕۆژی و پرچی شەوی و باڵای سەروی بەوە لاچی کە نازانن، نایانەوێ بزانن بەڵام کاشکی زانینەکەشیان زانین بوایە من لەگەڵ (ئەسیری نالێم

( تەرکی ئەشعاری عەشق بازی کە گەر زەوقت هەیە چونکە لای من، شیرینی دلبەران، لەنجەو لاری یاران جوانیە،) بەڵام بەشێکیەتی هەمووی نیە، لە هەموو ژیانێکدا بەتایبەتی لەژیانی شاخی ئێمەدا گەلێ جوانی تر هەیە کە پێویست بوو هەر لەمێژەوە، ئاگری حەماسەتی لەدڵی شاعرەکانماندا هەڵبگیرسایە. توخوا پێم بڵێن! کێ هەیە لە نیوەشەوێکی کوردستاندا لەزەردە پەرێکیا، لەبەری بەیانیکا لەڕۆژ ئاوایەکیدا سەیری کێو و کەژ بکا لە هاوینێکا سەیری گوڵشەن، لە بەهارا بڕوانێتە تارای سەوزو سووری دەرو دەشت لە پایزێکدا گوێی لە ورشەی ڕەشەباو خڕەی گەڵاڕێزان بگرێ، لەزستانێکدا گرمەی هەورو لێزمەی باران و بریسکەی بروسکەی گوێ لێ بێت چاو پێ بکەوێ! شاعریش ئەبێ نابێتە شاعر!!

# خزمەتکار

چیرۆکی نووسەری مەزن "سیمینۆف"

که "جیرازیم" بەر لە جەژنی کریسمیس بەچەند ڕۆژێ گەڕایەوە مۆسکۆ، لەوانە نەبوو پیاو ئیش و کاری تیا دەستکەوێت: هەر کرێکار و خزمەتکارە باش ملی دابووە فرمانەکەی خۆی بەتەمای ئەو جەژنانەیە کە چاوەنواڕبوو ئاغای بیداتێ. بەمجۆرە جوتیارە هەژەکارەکە سێ هەفتە خولایەوە بۆ فرمانێك بێ ئەوەی دەسگیری ببێت.

لەگەڵ ئەو کەسوکارو هاوڕێیانەیدا ئەژیا کە لە دێیەکەی خۆیانەوە هاتبوونە شار.

ئەگەرچی ئەوەندەش هەژارو لات نەبوو بەڵام زۆری پێ ناخۆش بوو کە ئەیبینی لاوێکی بەهێز و گوڕی وەکو خۆی بێکار ئەسووڕێتەوە.

هەر لە منالیەوە لە مۆسکۆدا ڕایبواردووە. بەمنالی ئامان "قاپ و قاچاغ" ی ئەشت لەکارخانەیەکی بیرەدا، لەپاشان بووە خزمەتکاری ماڵێك.

لەدوو ساڵی دواییدا بەردەستی کابرایەکی بازرگانی ئەکرد. ئەگەر بەهۆی عەسکەرییشەوە بانگ نەکرابایەوە بۆلادێ، تا ئێستا هەر لەسەر ئەو فرمانە ئەمایەوە. لەبەر هەرچییەك بوو "جیرازیم" ئەگیرا بەسەربازی، چونکو بەژیانی لادێ ڕانەهاتبوو، گوندەکەی زۆر پەست و کش و مات ئەهاتە بەرچاو، بۆیە بڕیاریدا بگەڕێتەوە مۆسکۆ، سا هەرچییەك ئەبێ بابێ.

تا زۆرتر ئەمایەوە زیاتر بێزار ئەبوو لە سوڕانەوە بەکۆڵاناندا بێ فرمان، هیچ ڕێیەك نەما نەیگرێت بۆ ئیش، بەسەر تێکردن هەموو دۆست و برادەرانی وەڕس کرد. هەندێ جار سەرەڕێی لە ڕێبوار ئەگرت و داوای لێ ئەکردن کە فرمانێکی بۆ بدۆزنەوە.

وای لێهات پێی نەئەکرا لەوە زیاتر بارێ بەسەر خەڵکەوە. هەندێ لە خانەخوێکانی لێی بێزار بووبوون. گەلێ لەو خزمەتکارانەی هاتوچۆی ئەکردن بەهۆی ئەوەوە توشی بۆڵەبۆڵ و نارەزایی ئاغاکانیان ئەبوون. زۆرجار بەدرێژایی ڕۆژ بەکۆڵاندا ئەسوڕایەوە بێ ئەوەی زاد بچێتە سەر دەمی.

(٢)

ڕۆژێ لە ڕۆژان "جیرازیم" چووە لای هاوڕێیەکی کە خەڵکی دێی خۆیان بوو، لەنزیك شاری مۆسکۆ ئەژیا. ئەم هاوڕێیەی عارەبانەچی بوو لای "شارۆف" ناوێك. چەند ساڵ بوو هەر لای ئەوبوو. توانیبووی خۆی بەرێتە دڵی ئاغاکەیەوە، زۆری لێ ڕازابوو و بۆ هەموو شتێك بڕوای پێ ئەکرد. ڕەنگە ئەم خۆ بردنە پێشەوەیەی لای ئاغا لەڕووی دەمشڕی و قسەگێڕانەوەیەوە بووبن، چونکە خزمەتکارەکانی تر هەرچییەکیان بکردایە، ئەم گورج بۆ ئاغای ئەگێڕایەوە، "شارۆف"یش ئەم خووەی زۆر پەسەند ئەکرد.

"جیرازیم" لێی چووە پێشەوە و سڵاوی لێ کرد، عەرەبانەچییەکە بەپیرەوە چوونێکی بەجێی کرد، هەندێ خواردەمەنی و چای ئایە بەردەم، لەپاشان لێی پرسی کە ئێستا چی ئەکات؟ ئەویش ووتی:

- زۆر حاڵم شڕە، چەند مەفتەیەکە بێ ئیش و کار ئەسوڕێمەوە.
- ئەی ئەچوویتەوە لای ئاغاکەی پێشووت تاڕات بگرێتەوە؟
- چووم
- ئەی ئەیویستیتەوە؟
- یەکێکیتر جێگەکەمی گرتبوو.
- ئێوە ئەوەندە بەنابەدڵی خزمەتی ئاغاکانتان یان ئەکەن کە فرمانەکەتان بەجێ هێشت ئیتر ڕێی گەڕانەوەتان بەقوڕ ئەگرن. ئایا پێویست نییە فرمانی خۆتان بەجۆرێ بەجێ بهێڵن کە ئاغاکانتان ئەوەندە خۆشیان بوێن لە بیریان ئەچنەوەو کە بەهۆی شتێکەوە دووركەوتنەوە لێیان و دواتر گەڕانەوە، بەڕووی خۆشەوە پێن بەپیرتانەوەو کێ جێگەی گرتین بۆتانی دەربکەن؟
- جا ئەوە چۆن ئەبێت؟ ئاغای وا کوا لەم زەمانەدا؟ بێجگە لەوە خۆ ئێمەیش فریشتەنین!
- قسەکردن چ کەڵك ئەگرێ؟ باسی خۆمت بۆ بکەم، من ئەگەر لەبەر شتێ دەستم لەم فرمانە هەڵگرت و گەڕامەوە ماڵی خۆم، "شارۆف" ئاغا هەردەمێ گەڕامەوە لای زۆر مەمنون ئەبێ بەرانگرتنەوەم.

"جیرازیم" مات دانیشت، بینیی هاوڕێکەی خۆی مەڵئەکێشن، ویستی بەپێکی ئەو لێ بدا، ووتی:

- من ئەوە ئەزانم، بەڵام کێ تۆی تیائەبێت؟ بڕواناکەم پیاوێکی تری وەکو تۆ هەبێت! ئەگەر چاکترین خزمەتکار نەبوویتایە ئاغات دوانزە ساڵ لای خۆی نەینەهێشتیتەوە.

"یەگور" چونکە زۆر حەزی لە ستایش ئەکرد، ووتی:

- ڕاستیەکەی ئەمەیە. ئەگەر پەیڕەوی ئەو دەستوورەت بکردایە کە من لەژیان و فرماندا لەسەری ئەڕۆم، یەك ڕۆژ بێ ئیش نەئەمایتەوە.

لەودەمەدا "شارۆف" عارەبانەچییەکەی بانگ کرد، ئەویش ڕۆیشتە دەرەوەو بە "جیرازم" ی ووت: "چاوەڕێم بکە هەرئێستا دێمەوە"

- زۆر چاکە.

(٣)

(٤)

ئێوارەی دوایی "جیرازیم" هاتەوەو لە هاوڕێکەی پرسی:

- توانیت هیچم بۆ بکەیت؟
- بەڵێ را ئەزانم.. جارێ باهەندێ چا بخۆینەوە ئینجا ئەچین.

وەنەبێ "جیرازیم" حەز لە چابکات، مەبەستی ئەوە بوو زوو بزانێ ئیشەکەی بەچی کەیشتووە بەڵام ڕواڵەت و ڕێژی هاوڕێیەتی ناچاریان کرد دانیشێت دوو پیاڵە چا بخواتەوە.. ئینجا هاوڕێکەی بردیەلای خاوەن ماڵ. "شارۆف" پرسیاری لێ کرد کەوا لەکوێ دائەنیشێت؟ ئاغاکانی پێشووی کێ بوون؟ ئینجا پێی ووت کە بەخزمەتکار ڕایئەگرێت و فرمانێکی تایبەتیی نابێت. چیی پێ ووترا ئەوە ئەکات و ئەبێ لەسبەینێ بەیانییەوە بێتەسەر ئیشی خۆی.

ئەم ئەخشە کتوپڕە کە بەختی هێنای، "جیرازیم" ی سەرسام کردو وەختە بوو گەشکەدار ببێت لە ..ژشیاندا.. دوای ئەختێ "جیرازیم" هات..ە ژووری عەرەبانەچییەکە.

عەرەبانەچییەکە پێی ووت: "چاکە کوڕم.. ئەبێ لەمەولا زۆر باش گوێ بدەیتە ئیش و کاری خۆت و بەتەواوی و چاکی بەجێیان بهێنێت تا خوانەکردە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەڕووی تۆوە تووشی شەرمەزاری ئەبم. خۆت ئەزانیت ئاغا چۆن کەسێکن.. هەر ئەوەیە جارێك بە هەڵەدابچیێ ئیتر تاماوێت لێت نابڕنەوەو لە کۆڵت نابنەوە.

- دڵنیابە "یەگور"

"جیرازیم" لێ یدا ڕۆشت، بەحەوشی خانووەکەدا تێپەڕیبوو، ژوورەکەی "پۆلیکار" یش بەسەر حەوشەکەدا ئەیڕوانی، ڕووناکییەکی کزی لێوە دیاربوو بەرپێی "جیرازیم" ی ڕۆشن ئەکردەوە کەلەو وەختەدا زۆر تاسەی بینینی ئەو ژوورەی ئەکرد کەوا بۆدواڕۆژی دائەنرێت. بەڵام شوشەی پەنجەرەکەی زوقم دایپۆشی بوو بەجۆرێکی وا کە پێی نەئەکرا ناوەوەی ببینێ. گوێی لە دەنگە دەنگێ بوو لە ژوورەکەوە ئەهات، ڕاوەستا گوێی گرت. گوێی لەدەنگی ئافرەتێ بوو ئەیووت:

"ئێستە چی بکەین؟"

پیاوێ وەڵامی دایەوە (بێگومان پۆلیکار بوو):

- ئازانم.. ئازانم.. بەشەقامەکاندا ئەسوڕێینەوە سواڵ ئەکەین!
- هەر ئەوەمان بۆ ماوەتەوە! چ ژیانێکی پڕ کوێرەوەری و مەینەتی ئەژین؟! هەر لەبەیانی زووەوە تا ئێوارەیەکی درەنگ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، ساڵ لەسەر ساڵ ئەچەوسێینەوە ورەنج ئەدەین کەچی هەر چوارێنە ساڵەوە ئیتر ئەبێت لەبرسانا سك هەڵکوشین و بمرین.
- چی بکەین؟ خۆ ئاغامان لە ئێمە نییە! لەچینی ئێمە نییە! چوونەلای و پاڕانەوەو لالانەوە چ دادێك نادات.. ئەوێ بەتەنگ چاکەی ئێمەوەیە؟
- هەموو ئاغاکان لەم پەستی و نزمییەدان.. هەموو هەرگوێ ئەدەنە خۆیان و بەتەنگ کەسی ترەوە نین.. هیچ بەبیریاندا نایەت کە ئێمە چۆن بەناموس و دەس و دەم پاکی ساڵەهای ساڵ خزمەتیان ئەکەین و ڕەنجیان بۆ ئەدەین.. تافی جوانی و گوڵی لاویمان لە پێناوی ئەواندا سیس ئەکەین و لەناو ئەبەین.. کەچی هەر کە دییان ئەو گوڕو هێزەی جارانمان ئەما، ئەترسن ساڵێك زیاد بمانهێڵنەوە.. ئەگەرچی هێشتا هەر بەرگەی کاروفرمانیشیان بگرین، هەر ڕوومان لێ وەرئەگێڕن! نایەڵن بەتەواوی پەکمان بکەوێت چونکە ئەوسا بێگومان خۆمان بەحەیای خۆمانەوە ئەڕۆین!
- "شارۆف" ئەوەندەی عارەبانەچییەکەی لۆمە ناکرێت.. ئەو ئەیەوێت فرمانێك بۆ هاوڕێکەی بدۆزێتەوە وا ئێمە ماڵوێران ئەکات.
- بەڵێ.. ئای چ توولەمارێکە؟ ئەزانێ چۆن زمان بگێڕێت! "یەگور" جانەوەرە زمان پیسەکە.. ڕاوەستە من تۆڵەت لێ ئەسێنم.. ئەچمەلای ئاغا پێی ئەڵێم کە چۆن ئەو ناپاکە دەستی ئەبڕێ و ئالیك و کاکەی ئەدزێ. بەئاغای ئەسەلمێنم کە ئەم ئامەردە هەرچییەکی بۆ گێڕاوەتەوە درۆو فیشاڵە!
- ئەم ئەم ئافرەت.. ئەکەی گوناهە!
- کام گوناه؟ بۆچی ئەوی پێی ئەڵێم، درۆن؟ خۆم ئەزانم قسەکانم هەموو ڕاستن.. هەموو شتێ بۆ ئاغا ئەگێڕمەوە.. بۆ ئەچم؟ بۆنەیکەم؟ ئەی ئێستە چی بکەین؟ بۆکوێ بچین؟ ڕووبکەینە کوێ؟ دابڕزاندین.. هەریەجارێ لەناوی بردین "دایە پرمەی گریانی بەکوڵ!".

"جیرازیم" گوێی لەهەموو ئەم قسانە بوو.. وەکو خەنجەر بکەن بە لەشیا وابوو.. زانیی کە هاتنی ئەو چ ماڵوێرانی و سەرگەردانییەك دووچاری ئەم پیرەمێردو پیرەژنە ئەکات! وای ئەزانی دڵی وەختە لێك بێتەوە. گەلێك لە شوێنەکەی خۆی مات ڕاوەستا.. نوقمی دەریای بیرکردنەوە بوو.. لەدواییا پاشەوپاش گەڕایەوە بۆ ژووری عەرەبانەچییەکە، ئەویش کەچاوی پێی کەوت؛ پرسی: ها هیچت لەبیرچووە؟!

"جیرازیم" بەزمانێکی تێکەڵ و پێکەڵەوە ووتی: ئەه.. هاتم گوێم لێ بگرێ.. ئەمەوێ زۆر سوپاسی ئەو خزمەتە بکەم کە بە منت کردووە! بەڵام من ناتوانم لێرە ئیش بکەم!

- چی؟ ئەڵێی چی؟
- هیچ.. حەزناکەم ئیش لێرە بکەم.. ئەگەڕێم بۆ فرمانێکی تر.

"یەگور" یەکجار تووڕەبوو، ووتی:

- ئەتەوێ لەبەرچاوی ئاغام بەشێتم دەربکەیت؟ ئەوەت نیازە هەی گێلی گەوج؟ هاتی ئەپاڕایتەوە یارمەتیت بدەم، فرمانێکت بۆ بدۆزمەوە، ئێستەش نایکەیت!؟ شەرمەزارت کردم نامەرد!
- خوێن هورووژمی هێنابووە سەروچاوی "جیرازیم"، چاوی شۆڕ کرد، بەڵام ورتەی لەدەم نەهاتە دەرەوە.

"یەگور" بەسووکییەوە پشتی تێ کردو بێ دەنگ بوو.

"جیرازیم" یش بەئەسپایی شەپقەکەی هەڵگرت و ژووری عەرەبانەچییەکەی بەجێ هێشت و خێرا حەوشەکەی بڕی لەدەرگاکە هات بەمەدیواو بەرانکردن لەخانووەکە دووركەوتەوە.

دڵی پڕبوو لە خۆشی و کامەرانی.

## هەندێ پەیڤ

*"گەلاوێژ" گۆڤارێکی ڕۆشنبیری‌یە یەکەمین نیازی بژاری، زمانی کوردی و ژیاندنی ئەدەبیاتی کوردی‌یە بە پاراستن و کۆکردنەوەی ئەدەبیاتی کۆن و ماوەدان بەبڵاو کردنەوەی ئەدەبیاتی تازە و وەرگێڕانی نووسینی جوان و کتێبی چاکی بێگانە.

ژمارە (١)ی گۆڤاری گەلاوێژ ١٩٣٩

*سڕینەوەی ناوی کوردستان هەر بۆ لەناوبردنی نەتەوەی کورد بووە، ئەگینا ناوی "پڕ لەجوانی و خۆشی و سیحر و پیرۆزی کوردستان" چ زیانێکی هەیە؟ ئەرێ خەڵکینە! مرۆڤ بانگ کردن بەناوی خۆی، وڵات دیاری کردن بەناوی خۆی شتێکی سروشتی و ئاسایی نییە؟ کە ئەمەواین ئەی بۆچی هەندێ لەناوی کوردستان دەسڵەمێنەوە؟ ئەڵێن گوایە ناوی کوردستان مانای جیا بوونەوەی کورد لە عیراق دەگەیەنێ.

ـ

ڕۆژنامەی خەبات

ژمارە (٤٣) ٣٠/ئابی/١٩٥٩

*لە نیسانی ١٩٥٦ دا دەستم کرد بە نووسینی ئەم داستانە ـ ژانی گەل- کۆسپی هەرە گەورەی ڕێگەم ئەوە بوو چۆن وابکەم لەچنگ سانسۆری ڕژێمی نۆکەری و کۆنەپەرستی (نووری سەعید) ڕزگاری بکەم و بیگەیەنمە دەست خوێندەوارانی کوردی. بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم کۆسپەدا ڕێگا کۆنەکەم گرتەبەر، ڕێگەی شوێنە ونی و شاردنەوەی زەمین و زەمانی داستانەکەو دەرنەخستنی ناوو ڕەگەزو نەتەوەی قارەمانەکانی. بەڵام ئەوی ڕاست بێ تامن بەکاوخۆ لێبوومەوە، مەرگی (شێخ مەحمود)ی گەورە و هەڵکوتانە نامەردانەکەی سەر میسری بەسەردا هات لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ دا. حکومەت ئەویانی کرد بە بەهانەی دامەزراندنەوەی حوکمی عورفی لەسەرانسەری عیراقدا بۆ ڕاونان و گرتن و ئازاردانی ئازایخوازان و ڕۆشنبیران. منیش لە پریشکی ڕزگارم نەبوو. دوای گیرانی خۆم،ماڵەوە کەوتبوونە شاردنەوەی کەل و پەل و نوسین و کتێبەکانم، هەر بەستەکەیان لە شوێنێ شاردبووەوە و هەر باوڵەیان بۆ لایەك ڕەوانە کردبوو. کە زوڵم و زۆر نەختێ تەمی ڕەویەوە و بەرەبەرە کەوتمەوە سەروکاری شتەکانم، هەندێ نووسین و کتێبم هەر بۆ نەدۆزرایەوە. لام وایە ئەوکەسانەی لامان دانابوون ترس زۆری بۆ هێنابوون سووتاندبوویان. لام وابوو ئەم داستانەش یەکێکە لەوانە. زۆر هەوڵم دا سەر لەنوێ بینووسمەوە بۆم نەکرا. تاپێرار لەناکاو هاوڕێیەك باوڵێ کتێبی بۆ هێنامەوە، دیم داستانە بۆرینی تیایە."

گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (٥)
١٩٦٩/٦/٢٢

## کریس کۆچێرا لەکتێبی

## (مێژووی کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستدا)

## دەڵێ:

*ئیبراهیم ئەحمەد کەسەرۆکی گەنجە ڕۆشنبیرەکان بوو، مرۆڤێکی زانایە، لەسەرەتاوە بەخاوەن دیدێکی ڕۆمانتیك و دواتر بە نووسەرێکی ریالیست ناساندراوە و وتراوە ئیبراهیم ئەحمەد بەڕاستی نوێنەرێکی پێشڕەوی ڕێبازی ریالیزمە.

دەسەڵاتی بەسەر ئەدەبیاتی زمانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیسی، فارسی‌دا هەبووە. چەند مانگێك پاش ئەوەی لەچاوان ون بووە، لە ئەشکەوتێكدا خۆی شاردۆتەوە، ڕۆژنامە نووسەکان چوونەتە لای و پرسیاریان لێ‌ی کرد، لە ئەشکەوتەکەدا چاویان بەکتێبخانەیەك کەوت کە کتێبی، ڕاسن و دیستۆفیسکی‌و مارکس و پاسترناك و لینین و پەرتووکی سالیسبۆری، ژان پۆل سارتەری تێدا بوو.

# پرۆژەی داهاتوومان

# تایبەتە بە

# (محەمەد مەولود مە م)ی

# چیرۆکنووس.

جیاکردنەوەی ڕەنگەکان ، هەڵۆ
چاپ، ئۆفسێتی دلێر